44

پرۆژەی تیشک



# بیرەوەرییەکان دەبنە گرنگ

## دیمانەی مامۆستای دێرین ئەحمەد سەعید مەولوود


ئامادەکردنی

ئەحمەد حسێن ئەحمەد

# بیرەوەرییەکان دەبنە گزنگ

## دیمانەی مامۆستای دێرین ئەحمەد سەعید مەولوود


ئامادەکردنی :

ئەحمەد حسین ئەحمەد



١٤٣٠ك

٢٠٠٩ز

ناوی کتێب: بیرەوەرییەکان دەبنە گزنگ، دیمانەی مامۆستای دێرین ئەحمەد سەعید مەولوود

ئامادەکردنی: ئەحمەد حسین ئەحمەد

ژمارەی سپاردن: () ساڵی ()

شوێنی چاپ:

نۆرەی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ:

نەخشەسازی بەرگ:

نەخشەسازی ناوەوە: ئیدریس سیوەیلی

لە بڵاوکراوەکانی: پرۆژەی (تیشك)، زنجیرە (٤٤)

ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت : www.tishkbooks.com

ئیمەیلی پرۆژە: info@tishkbooks.com
tishkbooks@yahoo.com

**سوپاس و پێزانین**

له ناخی دڵمەوە سوپاسی گەرمی پرۆژەی تیشك دەکەم که پێوازیان لەم نامیلکەیە کردو لە چاپدانیان گرتە ئەستۆی خۆیان، هەر سەربەرزوو سەرکەوتوو بن بۆ راژەی گەلەکەمان.

**ئەحمەد حسین ئەحمەد**

# دانانی پەیژەیەکی تر

بیرەوەریی بەشێکی گرنگو بەرجەستەیە لە مێژوو و هەمیشە حسابی تایبەتی بۆ کراوە. نەتەوەکانی ئەم دونیایە کەمو زۆر بەلێشاو کتێبی هەمەجۆریان لەم رووەوە هەیە، رێز لە ملوانکەی وشەکانی دەگرن. وەك سەرچاوە لەکاتی نووسیندا ئاماژەی بۆ دەکەن. هەولێیان داوە ئەوانەی تەمەنێکیان لەناو رووداوەکاندا بەسەر بردوەو بابەتەکان وەك خۆیان دەگێڕنەوە چاوپێکەوتنیان لە گەڵدا بکەن. بەوێنەو دیکۆمێنتەوە تۆمارەکانیان رازاندۆتەوە.

لای ئێمەیش چەندان ساڵە لە لایەن قەڵەمە بە ئەمەکەکانەوە بایەخ بەم بوارە دراوە. پێویست بە لیستی ناونووسینیان ناکات. مامۆستا ئەحمەد سەعید مەولوودیش وەك کادیرێکی بەسەلیقەو شارەزای بواری پەروەردە لەم ئەزمونەدا کۆمەڵێك یادەوەریمان پێشکەش دەکات بەهیوای کەڵك لێوەرگرتنیان بۆنەوەکانی ئەمڕۆو سبەینێ...

# ئەو دەمەی بیرەوەرییەکان دەبنە گزنگ

ئەگەر ژیان بیرەوەریی تیا تۆمار نەکرێت ساتەکانی بەناتەواوی ئاوادەبێت، ئەڵبەتە وەك گۆمێکی لەبەر نەڕۆیشتوو خانویەکی بێ بناغەی لێدێت.، چونکە هەناسەکان نامۆ دەبن وتروسکەی شادمانیو لێلآیی تالیەکان ناپێکن. لەم عاقارەوە بۆچونەکان دێنە زمان. روبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەو لاپەڕە تۆزلێنیشتووانەی لە گەنجینەی پرشنگدار پێکهاتون. بەشێنەیی دەروازەی شۆڕبونەوەکان دەخەنە سەر پشت. ئەو بوارە دووراو دوور هەتا بلێی هونەرێکی بێ سنورو کاریگەرییەکی سەرنج راکێش وهەژێنەرە. بەگێڕانەوەیان تریفە بەهەست وهەناسە بەتەمەن دەبەخشن. ئەم شارە خاوەن چەندان دەرون روناکی بەسەلیقەو بەهرەدارە. لە ئاکامی پیاداچوونەوە بەهەنگاوەکانی دوێنیێ دا، خونچەکانی بیرو سرنج دەم دەکەنەوەو گولاّو پرژێنی عەرشی پیرۆزی قەلّەمە خەمخۆرەکانی ئەم چاخە چاکە دەکەن. مامۆستا ئەحمەد سەعید مەولوود، کە لەدایکبووی ساڵی ١٩٢٤ی شاری سلێمانییەو لە بواری پەروەردەو پرۆسەی خوێندندا دەوری لە بەرچاوی هەبووە. دڵە گەورەکەیو مێشکە کراوەکەی پڕن لە تاڵە زێڕینەکانی یادەوەری. لەم رۆژانەدا چوومە خزمەتی لە شەقامی پیرەمێرد پێشانگای (مامۆستا) بۆ فرۆشتنی فەرشی نایاب، پرسیارەکان سەریان هەڵداو وەلآمەکانیش رێچکەیان بەم شێوەیە بەست: کەی چوویتە قوتابخانەو بیرەوەریە تاریكو روونەکانی سەردەمی منداڵیت کامانەن؟ لە وەلآمدا فەرموی: سالآنی ١٩٣٠ـ١٩٣١ نێرامە (مەکتەبی دوەم) دوایی نانرا بە فەیسەلّییە لە مەیدانی ماستفرۆشەکانی ئێستادا بوو. لە یادمە لە سالآنی ١٩٣٣/١٩٣٢ وێنەیەکیان بەپۆلەکەمان گرت من کەوتبوومە ژێرئالآی عێراقەوە لەبەر ئەوەی زۆر وردیلەبووم هەڵیان بریم تادەربکەوم لەوکاتەی سەرم دی بەئالآکەداو لەرییەوەو یەکسەر وێنەگرەکە چرکەی لێهەڵساندو وێنەکەی گرتین. وێنەی ئالآکە بە لەراوەییو دوانە دیارە. چەندجار بلآویش کراوەتەوە. باشترینیان لە ژمارە (٤٣) گۆڤاری سلێمانیدا کەمن وکاك جەمیل شەکیب ناوەکانمان ساغکردەوە. ماڵمان لە بەردەکی سەرا، تەنیشت ئوتێل مەولەوی ئێستابو. بەرێکەوت رۆژی شەممەی ئەیلولی ١٩٣٠ لەگەڵ

کۆمەڵێك منداڵی هاوتەمەنم یاریمان ئەکرد.. ئەوەندەمان زانی لە شەقامی سابون کەرانەوە بەرەو سەرا هاتن. هیتافیان دەکێشا بۆکوردستان ومافەڕەواکانی گەلی کورد.. یەکێك لەوانەی بەچاونەترسی لە پێشیانەوە بوو، مامۆستا فایەق بێکەسی شاعیربوو (١٩٠٥ ـ ١٩٤٨) بەپەرۆشەوە بەدەنگێکی زوڵاڵ دەیوت: ئێمە کوردین کورمان ئەوێ، خەڵکەکەش دەیان وت: (......نامانەوێ‌و نامانەوێ.. خۆپیشاندان. نەکە هەتا دەهات گەرمتر دەبو. ئێمە گوێ قوڵاغ بووین. پاشماوەیەکی کەم روانیمان لە سەربانی سەراوە لە لایەن عەسکەرەکانەوە دەستڕێژیان لە خۆپیشاندەرەکان کرد. چەندان کەس بەرکەوتن لە شەهیدو بریندار. ئێمەش بە قیژەو گریانەوە رامان کردەوە بۆ ماڵەوە. من لە ترسا خۆم خزاندە نا (کایەنەکەی) خۆمانەوەو خۆم متکرد. وامزانی عەسکەرەکان بەدوامەوەن دێن بمگرن. هەر لە تافی منداڵیدا رووبەڕووی بیرەوەرییەکی سەیر بوومەوە. ساڵانی ١٩٣١/١٩٣٢ جوابیان هێنا وتیان: مەلیك فەیسەڵی یەکەم لە کەرکووکەوە بەرەو سلێمانی دێت و سەردانی مەکتەبەکان دەکات کە کرا بەناوی خۆیەوە. ئیدی مەکتەب وحەوسەو دەوروبەری گسك دراو پاککرایەوە. لەوماڵانە راخەریان هێنا هەر لە مەکتەبەوە تاپردەکەی ئێستای شەقامی مەولەوی ئەو سەردەمە پردێکی کەلەپوری کۆنبوو. فەرش و بەڕەیان راخست دیمەنێکی جوانی دەنواند. هەموو قوتابیەکان لەمبەرو لەوبەری ریزکران. پاشان مەلیك فەیسەڵ لە دەرەوە لە جێبەکەی دابەزی. جوق ومۆسیقەی بۆلێدرا نزیکمان بووەوە ئێمەش تێکرا چەپڵەمان بۆلێدا. ئەویش سەلامی بۆکردین وهاتەناو مەکتەبەکەوە. لەگەڵ بەڕێوەبەرو مامۆستاکاندا تەوقەو سوپاسی هەموانی کرد. زۆری پێنەچوو گەڕایەوە لەگەڵ یاوەرەکانیدا سواری جێبەکەی بو، بەو رێگە باریك وناقوڵاییەدا چوو بۆناو بینای سەرای سلێمانی سەری لە موتەسەریف داو بەخێرهاتن کرا. تەشەکوری خەڵکی ئازاو دڵسۆزی سلێمانی کرد. هەر ئەو رۆژە بەرەو تەوێڵە رۆیشت. لەوێش پێشوازی گەرمی لێکرا. گەرماو گەرم لە لایەن چەند دەوڵەمەندێکی ئەوێوەهەندێ پارچە زەوی‌و زاری بەپیت وباشیان پێشکەش کرد. ئەمەیش نیشانەی بەخشندەیی‌و پێزانینی کوردیان بۆسەلماند. مامۆستا ئەحمەد سەعید مەولوود لە بارەی رێگاو بانی ئەوسەردەمەوە وتی: یەکەم جادەی سلێمانی هەر شەقامی سابونکەران بوو. ئەویش لە بەردەرکی سەراوە دەستی پێدەکرد هەتا ماڵی کەریمی هەیەر. جادەکە تابڵێی

تەسکبوو. لاتان سەیر نەبێ ئەگەر سەیارەیەك لە ڕێی کەرکووکەوە ئەگەر داخڵی ناوشار ببوایە ئەوەی کە ئێستا پێی ئەڵێن لای سەهۆڵەکە هەتاکو شەقامی مەولەویی، ئێستا هەمووی دەشتایی بوو. ئینجا بە هێواشی سەیارەی ناوبراو بەوجادە پێچاو پێچ وبەرد ڕێژکراوەدا دەهات لە لای ماڵی سەرۆکایەتی ئێستای زانکۆی سلێمانی، واتا دەروازەی شەقامی مەولەوی، لەوێشەوە ئەچووە لای عەلوە کۆنەکە بەرامبەر بەجەمعیەی ئێستا بەر گەراجەکەی قالە چاوجوان لە بەلەدێکەی ئەمڕۆدا کەشوێنەواری بینا کۆنەکە هەرماوە.. دیسان لەوێوە بەتەنیشت دەبۆکەدا دەڕۆیشت بەبەرمەتاعمیی مزگەوتی گەورە تەنیشت هەردو سینەما ڕەشیدو سیروان ئینجا هەربەوکولەمەرگیە دەهاتە ناو سەراوە. بۆمێژوو دەیلێم یەکەم جادەی سلێمانی کەبەکەڵك هاتبێ، هەرجادەی سابونکەران بوو کەبەشێوەی ئاسایی ئەوسا وشکەسی (قیرتاو) کرابوو. هەتا بلێی قەرەباڵخ بوو. وەك وتمان ئەگەر هەرسەیارەیەك لەسەر ئەو جادەیە بوایەو بڕۆیشتایە بەرامبەریش کاروانچییەك بەخۆیو ولاخەکانیەوە، یان سەیارەیەکی تریهاتایە ڕێگایان نەبوو، دەبولایەکیان بەرەو دواوە بگەڕایەتەوە. ئەمەی کەدەیلێم بەچاوی خۆم بینیوومە سەیارە تاك وتەراهەبوو هەرعەرەبانەی یایلی (دوئەسپی) زۆرتر منداڵەکە وردە دوای عەرەبانەو سەیارە دەکەوتن، خۆیان پیاهەڵدەواسی. لە بەرامبەر پرسیارێکی ترماندا کەبەڕێوەبەری پەروەردەی ئەوسەردەمە، واتا: (مدیری معاریف) لە کوێدابو؟ فەرموی: لە یادمە دائیرەی ماریفی ئێمە عائیدی کەرکوك بوو. ئەو لقەی کەلەسلێمانی کرایەوە لە ماڵی ئێمەدا چەندان هۆدەیان بۆدانرابوو. بۆخۆشی ئەیگێڕمەوە موفەتیشێکمان بە ناوی (سەید نوری بەرزنجی کۆنە کۆتری) کە بێکەسی شاعیر بە شیعر حەشری پێکردوە. باش کوردی نەدەزانی هەوڵی دابوو ڕێگای سلێمانی پێنجوێن بکرێتەوە تاکو هاتوچۆ ئاسان بێت. ئەم قسەیەی دوبارە دەکردەوە: ئەمن زۆر فەرەح کردم. دائیرەی ئیشغاڵ زۆر جەهد کردی تەریق سەیارە بۆپێنجوێن بردی.. ئیتر ئێمە لە نێوانی یەکتریدا هەر ئەوەمان دەوتەوە. بۆپشتیوانی یادەکەی مامۆستا ئەحمەد چەند نمونەیەك لە شیعری بێکەس لەم بارەیەوە بۆگاڵتەو گەپ بیر دەخەینەوە:

ئەمن لە تەفتیش چولە کوردستان

ئەمن دیت مەنزەر وە باغ وبێستان

لەوسەنەی مازی چۆمان لە پێنجوێن

دیتمان زۆر خەزرائو رەنگین

زۆر پیاوان گەورە چون لەوجێگا

ئیستیغراب کردیان لەم جەدید رێگا

دائیرەی ئیشغاڵ زۆر جەهد کردی

تەریق سەیارە لە پێنجوێن بردی

ڕەشۆل موغەنی حەرب دەیکردی

قلوب عالەم جەلب دەیکردی

... تاد

لەشوێنێکی دیکەدا بێکەس بەدەم سەیدنورییەوە دەڵێت:

ئەو سلێمانی جدا **لطیف**

**ولاسیما لە فصل حزیف**

**مناغ معتدل أثمار مختلف**

**اشهد بالله لە** خۆم **معترف**... تاد

بڕوانە دیوانی بێکەس چاپی هەولێر ساڵی ٢٠٠٥ لاپەڕە (١٨٦) و (١٨٩) یەکێکی تر لەبیرهاتنەوەکانم هەر لەوتەمەنەدا یان بچووکتربووم، ئەوەبوو خوا لێخۆشبوو سالەی سەعەی قالەی سەمون (سالە شێت) ، کەشێتێکی قسە عەنتیکەو بەناو بانگی جارانی شاربو. گەورە پیاوان لە دەوری کۆئەبونەوە گویان بۆقسەکانی رائەگرت. بەسەرسامییەوە لە هەڵسوکەوتیان دەڕوانی. لە یادمە باوکم بردمی بۆسەر خەرمان لە ناوچەی بازیان. خەرمانەکەمان تەواوببو. چاوەڕوانی گێرە کردنی بووین، مامە سەعدیو قالەو سالە شێتی کوڕیشی لەوێ بوون. باوکم زۆر یارمەتی دەدان. ئەوەندەمان زانی سالە شێت لەو لاوە بێباکانە شقارتەیەکی نا بە خەرمانەکەمانەوە. خەرمان کڵپەی کردو سووتا. سالەشێت قریوەی پێکەنینی دەهات ودەیوت ئاگرەکەی چەند گەورەو گەرم وخۆشە. بێگومان ئەوە کارەساتێکی جگەر بڕو ناخۆشبو. باوکم هەناسەیەکی خەمناکی هەڵکێشاو وتی: دەك دەستت بشکێ، چی لەگەڵ شێتا دەوترێت؟ : ئەو بەشە بەشە خوا بیدات.، بەلآم باوکی سالە

شێت دایە پڕمەی گریان وباوکەڕۆ باوکەڕۆو کوڕوزانەوە.. دوعای پەنجە هەڵوەرین وکوێرایی داهاتنی لە سالە سەرلێشێواوی کوڕی دەکرد. ئینجا گریانەکەی دوبارە دەکردەوە نەیدە پڕییەوە. باوکم وتی: سەعەیگیان پێشهاتەو چار نییە هەرچی رۆی رۆی، من خەرمانم سوتاوەو وازم هێناوە تۆیۆ بێدەنگ نابیت؟ مامە سەعە بەهەنسکی گریان وچاوی پڕلەفرمێسکەوە وتی: قوربان بۆبەختی خۆم دەگریم، ئەمساڵ لە خەرمان بەرەکەت بێبەشبووم.

## ئەو مەزبەتەیەی ئاگام لێی نەبوو

((بەشێکی تر لە بیرەوەریەکانی سەرەتای دامەزراندنی مامۆستا ئەحمەد سەعید مەولوود لە قوتابخانەی گوندی قەمچوغە..)) کۆمەڵێك لە مامۆستایانی خانەی مامۆستایانی ریفی کە لە بەغداد گەڕاینەوەو لەوێوە فەرمانی دامەزراندنمان بۆدەرچو.. بەندە بۆیەکەم جار لە سالآنی ١٩٤١/١٩٤٢ بۆقوتابخانەی گوندی قەمچوغە دانرام. لە خۆشیدا وام دەزانی هەموو دنیا هی خۆمە.. سواری ئۆتۆمبیل بووم گەیشتمە ناو دێ، سرارەم لەسەر کرد، کەڕوانیم دێکە هەمووی موچە موچەیە، بەکارو کاسپییەوە خەریکن قوتابیەکانی کەمبون.. مامۆستایەکی مەسیحی لێبوو بەناوی نحاداود خەڵکی بەرتەلەبو. ئەو کوردییەی پێی دەدوا پچڕ پچڕو ناتەواو بوو. لەبەر ئەوە فەراشەکەم دۆزییەوەو پێکەوە کەپڕ بەکەپڕی ناودێو دەورو بەری گەڕاین بەکەسوکاری منداڵەکانم وت: لە سبەینێوە منداڵەکانتان بنێرنەوە مەکتەب.. ئەوەی سەرپێچی بکات گاڵی پۆلیسی لێدەدەین.. خوا هەڵناگرێ رێنماییەکەمیان لاپەسەندبو. ئەوەی لێرەدا جێی باس وسەرسوڕمانە.. مێرمنداڵێك هەبوو حەزی بەخوێندن دەکرد، وتی ئەفەندی گیان: توخوا من لە بیرمەکە زۆر حەزم لە مەکتەبە. وتم باشە ئافەرین لەم رۆوە تۆقوتابیت. کەدەوام دەستی پێکرد وردە وردە مەکتەبمان رازاندەوە. کەم وکوڕیمان کەمکردەوە. مێر منداڵەکە لە هەموان روتەلە تربوو زۆر بەگەرمی دەوامی دەکردو گوێڕایەڵ وچالاك بوو. بەیانیەکیان وتی: بەداخەوە ئەفەنی ئیتر من نایەمەوە بۆمەکتەب: منیش وتم: بۆچی رۆڵە؟ وتی: دایکم ناهێڵێت، دەڵێت ئەگەر

وازنەهێنی بەم چەقۆیە خۆم دەکوژم.. ئەم وەڵامەم بەلاوە سەیربوو لەگەڵیدا چووم بۆماڵەکەیان.. روانیم پورە ئامینە چەقۆیەکی لە لای خۆیدا داناوە.. داوای سەلامم لێکردو چۆنیو چاکی بەهێمنی پێموت: باجی گیان بۆچی ئەو چەقۆیەت لای خۆتەوە داناوە؟ وتی: هەتا خۆمی پێبکوژم.. وتم: لەبەرچی؟ بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە وتی: ئەفەنی لێت ناشارمەوە، تۆ دەتەوێ لە برسا بمرین.. وتم: بۆچی؟ وتی: کوڕم هەرچی هەمەو نیمە لە ماڵی دنیا، حەمەی کوڕم و ئەم تورەکە زەخیرەیەو خوداو تاقە بزانێکم هەیە.. زۆر داماو برسیو رووت و قوتین بە رۆژ حەمە دەنێرم بۆ ئەو دەشت وکەژە چارۆکەیەك گەڵاو گیای وشك کۆبکاتەوە، تا بیدەین بەم بزنەی لای سەرمەوە.. کە تێربوو، بەیانیان دەیدۆشم.. شیرەکەی دەمانژێنێ وتم: چۆن؟ وتی: شیرەکە دەکەمە ئەم مەنجەڵەوە دوو چنگ گەنمی تێدەکەم و بەچیلکە دار، یان تەپاڵە دەی کوڵێنم.. ئەوەیە خواردنی سەرەکی خۆم وکوڕەکەم (ئامەو حەمە) .. ئەفەندی گیان جائەگەر کەسێ نەبێ گەڵا بۆ بزنەکە پەیدا بکات، ئەوا خۆم و کوڕەکەم و بزنەکەش پێکەوە دەمرین.. منیش زۆر زۆر بەزەیم پیادا هاتەوەو وتم: هەقتە باجی گیان هەقتە. کە گەڕامەوە بۆ مەکتەب پەستی و پەژارە بوون بە مێردەزمەی سەردڵم. لە سەردانەوەمدا بۆ سلێمانی ئەم چیرۆکە راستە قینەیەم بۆ باوکم گێڕایەوە.. گلەیی لێکردم گوایە بۆچی ئاگادارم نەکردووە، ئینجا هەرخۆی وتی: قەیناکە نەچووە بچێت، کەرۆیشتییەوە بۆقەمچوغە چاوەڕوانبە فەردەیەك گەنم لە رێی خودادا دەبەخشم بەو ماڵە هەژارەو دەیخەمە پشتی سەیارەیەکەوە تا ل ەچایخانەکەی کانی سارد دایگرن و بیگەیەننە جێگەی مەبەست. منیش لە گەڕانەوەمدا نەجمی چایچیم راسپارد کە ئاردەکە گەیشت ئاگادارم بکات. رۆژی دوایی وەڵامم بۆهات خێرا حەمەم بانگکرد کەرێکمان پەیداکرد گەشتینە چایخانەکەو بارەکەمان لێناو بەکاوە خۆهێنامانەوە، لە ماڵی پورە ئامینە دامان گرت و وتم: ئەمە دیاری باوکمە بۆ تۆ.. پورە ئامین لە خۆشیدا گەشایەوەو کەوتە دوعای خێرکردن.. کوڕە بەخوا بڕوا بەخۆم ناکەم کەخاوەنی ئەم هەموو دانەوێڵەیەم. ئەمساڵۆ ساڵێکی تریش لە برسا نامرین خوایە لێت بەزیادبێ. دوای دوسێ مانگ هات بۆلام وتی: ئەفەنی لە سایەی سەری تۆوە گەنمم زۆرە خزمان داوای لێکردوم بەنیوەی بۆم بکەن بەتۆو، تۆدەڵێی چی؟ منیش وتم پورێ گیان گەنم گەنمی خۆتە چی لێدەکەیت کەیفتە. بەڵێ کاتێ

تۆو کرا بەرهەمی چاکی دابەدەستەوە. ئەگەر چی ئەوماوەیەی لە قەمچوغەبووم تابۆم بکرایە یارمەتی گەورەو بچووکم داوەو وەك کوڕێکی دڵسۆزی گوند لە تەکیاندا ژیاوم، چییان پێویست بووبێت بۆم ئامادەکردون.. ئەوەندەی نەبرد بەفەرمانێك گواسترامەوە بۆشوێنێکی نزیك لە شارەوە ئەویش گوندی قەرەچەتان بوو. نزیکەی دومانگ لەوێ مامەوە، بەڵام بێ ئەوەی بەخۆم بزانم ولێی بەئاگابم گوایە دانیشتوانی گوندی قەمچۆغە لە ناو خۆیاندا راوێژیانکردوە کەهەوڵبدەن بمگێڕنەوە بۆقوتابخانەکەی خۆیان لە قەمچوغە. هاتومەزمە تەکیان کردبووەوە هەموو پەنجە مۆریان کردبوو. بردبوویان بۆناحیەی سورداش، ئینجا قەزای دوکان لەوێشەوە مەزبەتەکە بەئیمزاکراوی‌و پەراوێز لە سەر نووسینی رەوانەی نووسینگەی موتەسەریفی سلێمانی کرابو، موتەسەریفیش رەوانەی مدیری معاریفی دەکات وکێشەکە گەورە کراوە گوایە من خەڵکم لە حکومەت هەڵگەڕانۆتەوە بۆیە لە قەرە چەتان پۆلیس ئاگاداری کردم تا بچم بۆ لای مدیری معاریف، کە جەنابی (مستەفا مەزهەر) بوو. کاتێ چوومە ژوورەوەو خۆمم پێناساند، کەللەی بوو وتی: ئەفەنی بەناخێری گیانت هێشتا لە وەزیفەدا جێگیرنەبووی ئەم هەراو هوریایە چییە ناوتەوە؟ وتم: قوربان بەخوای گەورە ئاگام لە هیچ نییە. ئینجا پێچراوەیەکی دەرهێناو پیشانی دام و وتی: ئەمە چی لێدەکەی؟ وتم: جەناب پێت دەڵێم بێئاگام لەبەرئەوەی وەك ئەفەندییەك لەگەڵ دانیشتوانی گوندا گونجاو بووم. رێزو خۆشەویستی‌و هاوکاریمان لە نێواندا هەبوو.. خۆیان دوای ئەم بابەتەکەوتون. وتی: لەوانەیە دەستی تۆیشی تیابێت. وتم: قوربان حەزمکردوە گواستراومەتەوە بۆقەرەچەتان، چونکە بەنیسبەت منەوە بۆهاتوچۆ ئاسانترە.. جەنابی مدیر مەعاریف بۆئەوەی نەختە ئیجرائاتێ بکات وتی: دەبێت لە قەرەچەتانەوە یەکسەر بگوێزرێیتەوە بۆ سەرگەڵوو.. بڕۆ لە دوسبەیەوە لەوێ دەوام بکە، وریابە ئەم جۆرە هەواڵانە نەبیستمەوە. دوای بۆی دەرکەوت چ مامۆستایەکم رێزی تایبەتی لێنام بەوەی کەمامۆستا عەزیزی حەمەکاکە پشکنەر (مفیش) بوو هات بۆ سەرگەڵوو سوپاسنامەو راپۆرتی جوان وبەوێژدانانەی لەسەر نووسیم.. منیش لە تەمەنی خۆمدا بڕیارمداوە تاماوم چاکە بکەم وبیدەم بەدەم ئاوەوە.. .. لە داهاتودا هەردێتەوە رێم. هەروەها دەیوت مامۆستا فایەق بێکەس لە کاتی‌و چانی سەری سالاندا بەخۆڕایی دەرزی پێئەوتین تاکو پتر بچینە ناخی

خوێندەوارییەوە. بەدەم دەرس خوێندنەوە باسی خۆشەویستی میللەتو نیشتیمانیشی بۆدەکردین. دیسان مامۆستا بەشێنەیی چەند بیرەوەرییەکی سەردەمی دەسبەکاربونی مامۆستایی خۆی بۆگێڕاینەوە، تیایدا وتی:

ئەوباس وڕوداوە خۆش وناخۆشانەی سەردەمی مامۆستایەتیم زۆرن ودرەنگ کۆتاییان پێدێت، بەڵام باڵەهەندێکیان بدوێین. ساڵانی: ١٩٤١/١٩٤٠ بووم بەمامۆستا چەندان قوتابخانەی گوندو شارانم کردوە. گەلێك جاریش بەڕێوەبەر بووم و رەوانەی خوارووی عێراقیش کراوم و چەرمەسەری‌و غەریبی‌و نەهامەتیم چەشتووە. کاتێ بە پەلە لە لایەن مدیری معاریفی سلێمانییەوە فەرمانی گواستنەوەم بۆدەرکراو گواسترامەوە بۆ قوتابخانەی گوندی (سەرگەڵوو) .. هەر لەوکاتە مامۆستایەکی هەرە ناسراو و هاوتەمەن و هاوڕێم نێرا بۆ جێگەکەم لە قەمچوغە، ئەویش مامۆستا ئیبراهیم ئەمین باڵدار ١٩١٩ ـ ١٩٩٨بوو. گواستنەوە ئەگەر بە کەیفی خۆت نەبێ نیگەرانییە. بەناچاری شتەکانم لەکەل وپەل پێچایەوە، لە ناودێ هێسترێکم بەکرێگرت. ماڵئاوایم لە دانیشتوان کرد. بەرەو سەرگەڵوو رێم گرتەبەر. هێشتا لە قەمچوغە دوور نەکەوتبوومەوە ناسراوێکم پێیوتم: خوابتگرێ بۆکوێ مل دەنێیت.. بڕوابکە لە سەرگەڵوو دەتکوژن. منیش وتم: جەناب مامۆستام تائێستا خوانەخواستە هیچ کارێکە گەندەڵیم لێنەوەشاوەتەوەو ناوەشێتەوە ناترسم وکەسیش هقی بەسەرمەوەنیە. کابراش وتی: کورە بەدوشت تۆتاوانباری: یەکەم سرارەت لەسەرد انییە، دوەم نوێژ نەکەری. خۆت دەبینیتەوە کابرا رۆیشت ومنیش پاش چەند سەعاتێ لەگەڵ خاوەن هێسترەکەدا گەیشتمە سەرگەڵوو. لە مەکتەبەکە لامدا. خەڵکەکە بەخێرهاتنیان کردم. کەسایەتی ناسراوی ئەوێ (کاکە رەزای شێخ عارف) پێشوازییەکی گەرمی لێکردم وبردمیە دیوەخانەکەی خۆیان. لەوێ نانم خواردو پشوومدا دوای هەندێ پرسیارو وەڵام وخۆپێناساندن گەڕامەوە ژوورەکەی خۆم. بەتێپەڕبونی چەند رۆژێك پتر لەگەڵ یەکتر نزیك بووینەوە. بۆم دەرکەوت کۆمەڵگەیەکی کراوەو پێشکەوتون شەوگاران یاری‌و دانیشتن و قسەی خۆشمان پەرە پێدەداو. هەر لەوساڵانەدا ١٩٤٤/١٩٤٣ هەستم بەوە کردبوو کەخزمانی کاکە رەزاو ئەوان بەهاران لە گوندی عەسکەرەوە دەهاتن بۆ سەرگەڵووو. شێخانی گوندی عەسکەریش کەسانێکی لێوەشاوەو چاکبون. رۆژێکیان قوتابییەکان لە کاتی پشوودا لە حەوشەکەدا

خەریکی جموجوڵو یاریکردن بوون. وەختێکی زانی قادری فەراش منداڵێکی دەموچاو خوێناوی هێناو. منداڵەکە هەردەگریا. بەپەلە بردمانە ژوورەوە. بە پەڕۆو لۆکە دەموچاویمان سڕیو پاککردەوە. پێموت کوڕم بۆ وات لێهاتووە؟ بەهەنسکەوە وتی: ئەفەندی گیان ئەوکوڕە لێیدام. منیش تووڕە بووم و منداڵەکەم بانگکرد. لەبەرچاوم نامۆبو، تاتوانیم شەپازلەیەکم پیادا کێشاو وتم: خوام لەوخوایە لە منداڵێکی تریدەی.. منداڵەکە بەگریانەوە رایکرد. ئەوەی راستی بێت تۆزێك بۆی خەفەتباربووم. ئیتر نەمدیەوە تاساڵانی ١٩٦٨/١٩٦٧ لەبەر بازاڕی عەسری ئەڕۆیشتم گەیشتمە دەرگای دوەمی بازاڕەکە، چەکدارێك هاتە بەردەمم و وتی: مامۆستا بێزەحمەت لەوبەرەوە بانگت ئەکەن. منیش لەوەڵامدا وتم: کاکە لەوانەیە لێت تێکچوویێت من نەبم یەکێکی تریێت. روانیم یەکێك لەبەر کتێبخانەی گەلاوێژدا راوەستابوو ئاماژەی بۆمن کردو وتی: خۆیەتی. ئەنجا پەڕیمەوە ئەوبەر وتیان: لە ناو کتێبخانەکە تۆیان دەوێ. کەچووم رومکردە رەئوف مەعروف کەهاوڕێی رۆژگارانم بوو وتم: /ڕەئوف دیسان چیت لێمان دەوێ؟ بەخەندەیەکەوە دەستنیشانی تەنیشتەکەی کرد وتی: ئەم بەڕێزە تۆی گەرەکە.. منیش نەم دەناسی وتم: فەرمو برا منت بۆچییە.. ئەنجا لەبەرم هەستاو لە ناو ئاپورەکەدا وتی: مامۆستاگیان تۆچەپەیت یان راستەیت؟ منیش بەسەر سامییەوە وتم: وەڵاهەردوکیانم. دەستی گرتم و وتی: بەم دەستە پیرۆزەت کاتی خۆی کەمنداڵێك بووم بزێوبووم زللەیەکت لێداوم لەورۆژەوە بوو بەدەرس بۆم تاکو ئێستا خراپەم لەگەڵ کەسدا نەکردوەو توخنی شەڕو شۆر نەکەوتووم. حەزدەکەم ئەمرۆیش بەو دەستەی ترت زللەیەکی تر لەولام بدەیت تاکو پیتر دەرس وەربگرم لێت.. منیش وتم: سوپاسی هەستی ناسك وپیاوانەت دەکەم، بەندە (عەلی عەسکەرە) یە، ئەومنداڵەی لە ساڵانی چلەکاندا کە لە سەرگەڵوو بووم، بەخێزانەوە هاتبووین بە میوانی بۆماڵی خزمی بەڕێزم، کاکە رەزای شێخ عارف لە منداڵێمدا.. ئیدی خەیاڵ بردمیەوە بۆم دەرکەوت راست ئەکات. بۆیە بەدڵنیاییەوە لە بەرچاوی خۆیو هاوڕێکانی پێموت: چاوەکەم تۆئێستا پیاوێکی گەلێ تێکۆشەرو گەورەیت، دڵنیابە هەر شۆڕشێك خاوەنی سەرکردەی وەك تۆبێت هەر سەردەکەوێت ئەگات بە ئامانجی. ئەو ماوەیەی لە سەرگەڵو بووم بەوپەڕی شادییەوە کاتەکانم لێدەڕۆیشت وەکو کەسی نادیێ سەیر دەکرام ساڵانی ١٩٤٦/١٩٤٥

گواسترامەوە بۆگوندی جافەرانی سەر بە ناحیەی قەرەداخ. لەوێ بووم بە بەڕێوەبەر..
جافەران دێیەکی دلگیرو کراوەو دیمەن جوان بوو بەترێو میوەی زۆر بەناوبانگ بوو.
بەرێکوپێکی پرۆسەی خوێندنمان بەسەر ئەبرد. لەوسالانەدا ئەم مامۆستا نەمرانەم
لەگەلدابوو: مەحمود ئەحمەد (ئازاد) کە نووسەرو خەباتکارو پەرۆشی نیشتیمان بوو. کەزۆری
نەبرد پەیوەندی کرد بەکۆماری مهابادەوەو لەوێ هەناسەی بەختەوەری هەلکێشا. ئەدیبی
ناسراو مامۆستا عومەر مەعروف بەرزنجی لە لێکۆلینەوەی بیبا جوگرافیای چیرۆکی کوردی
یەکەیدا لاپەڕە (٨٣) دەربارەی مەحمود دەلێت: لە سالی ١٩١٧لەڕەواندز لەدایکبوە.
نوسەرو خەباتکەری نەترسبووە. لە سەرەتادا کتێبی گولالەو ئادەمیزاد لە سایەی
دەربەگێتیدا سالی چاپکردووە سالی ١٩٦٠بەچیرۆکی جوان هاتەوە مەیدان. لە رۆژنامەو
گۆڤارەکانی ئەوسەردەمەی خۆیدا بەرهەمی بلاوکردۆتەوە، بەتایبەت لە (ژین) و (بلێسە) ،
رۆژی ١٩٦١/٩/٧ کۆچی دوایی کردووە. غمامۆستا رەفیق چلاك جگە لە مامۆستایی
هونەرمەندو دەنگخۆش وئەکتەرێکی کەم وێنەبوو، لە نووکتەو قسەی خۆشدا رۆلی هەبوو.
مەلانەجمەدین، کەمەلایەکی لێهاتوی ئاینی بوو کرابوو بەمامۆستای مەکتەب لەوە
دواگواسترایەوە بۆدادگای سلێمانی بوبە نوسەری شەرعیە. ئای کەژیانی لادێ پڕچێژو خۆشی
بوو. بۆ سالی دوای ١٩٤٦گواسترامەوە بۆ ناوەندی ناحیەی قەرەداخ.. چوومە شوێنی
مامۆستای بەتواناو نەمر حسین سالح ئاغا کە بەڕێوەبەر بوو، تەنانەت وتی: وەرە شوێن
خانوەکەمەوە، ئیدی ژیانم دابین بوو. دوسال لەوێ مامەوە هەمیشە لەگەل هاوڕێ
مامۆستاکاندا دیدەنی یەکتریمان دەکرد. لە قوتابخانەی قەرەداخ هەمیشە ئەم مامۆستایانە
هاوکارم بوون: نوری ئەحمەد قەرەداخی. حەمە سەعید ئەحمەد قەرەداخی، کەهەردوکیان
برابون، حەمەی حاجی رەزا، قاقۆز بنیامین ـ مەسیحی بوو، هەتا ئەم سالانەی دوایی
قەشەی کەنێسەی عەنکاوە بوو لە پارێزگاری هەولێر، ئێستا کوڕەکەی جێگریەتی. هاوپۆل
وهاوڕێی مامۆستاییم زۆر بوون، لەوانەی شاعیری گەورەو ناسراو مامۆستا ئەحمەد حەسەن
بەگ ـ هەردی ـ هەر لەو سالەدا ناوبراو وەك نەفیکردن بە فەرمانێکی کارگێڕی معاریف
رەوانەی گوندی جافەران کرا. لەوێ لە بالەخانەیەکدا بوو.. ژیانی تەنگی بەسەر دەبەرد.
هەمیشە هاتوچۆی یەکتریمان دەکرد. بەرەبەرە باری ژیانی ئاسایی بووەوە. لەیادمە

جارێکیان هاتمەوە بۆ سلێمانی مژدەی وەرگرتنی رادێۆم کەوتە بەرگوێ. یەکسەر چووم بۆگەنجینەی ئەوسا بەرپرسەکەی مامۆستا شێخ ئەورەحمانی شێخ عومەر کە ئەویش هاوپۆل وهاتەمەنم بوو. پێیوتم: رادیۆمان بۆهاتوە بەباتری تەڕ وات باتی سەیارە لە پەنجاو سەشتەکاندا بەوڕادیوو باتریانە یان دەوت (کەرو جاش) ، شێخ ئەورەحمان پێیوتم: ئەحمەد تۆ نووسراوێك بنوسە بۆدائیرەی معاریف داوای رادیۆ بکە، بافریابکەوی، چونکە چەند دانەیەکم لایە. منیش نوسراوەکەم بەجێی خۆی گەیاند. رادیۆیەکی لۆکی نایابم وەرگرت لە بازاڕ باتریەکم بۆکڕی شێخ وتی: لە ماڵی خۆت دایبنێو پارێزگاری لێ بکە. ئیتر بەتەواوی رادیۆو باتریو وایەرم لەگەڵ خۆم بردەوە بۆقەرەداغ، لە ماڵەوە خەریکی دانانی بووم..، چونکە دەبوایە دوعەمودی دار لە سەربان بچەقێنرایەو وایەرەکانی پێوە شەکل بکرانایەوەو بگەیەنرایە رادیۆکە.. کاتێ رادیۆم کردەوە خەڵك سەرسام بوون وماڵەکەم جمەی لێوە دەهات. کەگۆرانیو وتارو دەنگوبسی دەخوێندەوە سەریان سوڕدەما. ئەمەیش بۆمێژوو دەڵێم ئەحمەد سەعید مەولوود یەکەم کەس بوو کە ئامێری رادیۆیی گەیاندە ناحیەی قەرەداخ ودەورو بەری. رووداوەکانی ئەوڕادیۆیە کەم نەبوون، بەڵام لێرەدا دوانیان ئەگێرمەوە بۆتان: شایانی باسە بەڕێکەوت لە ماڵەوە رادیۆکەم کردوەوە لاسلکی نێوان ناوەندی سلێمانیو ناوچەی قەرەداخی وەرئەگرت,گوێم لێبو، لاسلکیەکووتی: ئەحمەد حەسەن ئەفەندی (هەردی) فەسڵکراوە تکایە ئاگاداری بکەن کەبەپەلە بگەڕێتەوە بۆسلێمانی.. منیش خورپە دای لە دڵم وتم: یاخوا خێربێت خۆم کۆکردەوەو بەپێ کەوتمەرێو گەشتمە جافەران، ئەوشەوە لای ئەحمەد هەردی مامەوە هیچم نەوت، ئەوە نەبێ وتم: پێم خۆشە کەلوپەلەکانت گرد بکەیتەوەو بچینەوە بۆماڵی خۆمان لە قەرەداخ. ئەویش بەقسەی کردم وڵاخمان پەیداکرد هاتینەوە قەرەداخ. شەو لای من مایەوە لە کاتی دانیشتنماندا راستیەکەم تێگەیاند کەلەڕادیۆ بۆرەوە بەگوێی خۆم بیستومە کەجەنابت بانکراویتەوە بۆسلێمانیو گواستنەوەیەکی ئاوا لە ئارادایە. پێم وت باکەلوپەلەکانت لای من بن، ئیتر بۆبەیانی لەگەڵ کاروانچییەکی بەناوبانگی قەرەداخ کەناوی ئەورەحمان تەپڵ بوو بەسواری وڵاخەکەیەوە بەرەو سلێمانی رۆیشتەوە. ساڵی ٢٠٠٤ کەمامۆستا ئەحمەد هەردی هاوڕێم تەشریفی لە هەندەرانەوە هێنایەوە بۆسلێمانی دیدەنیم کردو باوەشمان کرد بەیەکداو لە دانیشتندا ئەم

بیرەوەریەمان هێنایە ئاراوەو جەنابی هەموی لەبیربوو.. هەردو چەند هەناسەیەکمان هەڵکێشا کە ژیان چی هێنایە ڕێمان. دیسان لەسەر مەسەلەی دەنگوباسی رایۆ بۆر، جارێکی تر مامۆستایەکی هاوڕێم کەلەقوتابخانەی گوندی (تەکیە) مامۆستابوو هاتبوو بۆقەرەداخ بۆ نیوەڕۆ میوانم بوو. لە گەرمەی دانیشتندا دەستم برد رادیۆکەم کردەوە، هەردو گوێمان لێبوو کەبروسکەیەك خوێنرایەوە لە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی سلێمانییەوە بۆناوەندی پۆلیسی قەرەداخ هەتا کەزو بەزو مەجید سەعید نێرگەلە لە ١٩٢٤-١٩٩٨کەئەفەندییە بیگرن وقۆڵبەستی بکەن بیهێنن بۆ سلێمانی، بێگومان مامۆستا مەجید سیاسەتی رژێمی پاشایەتی پێباش نەبوو، دژی ئەوەستاو راپۆرتیان لەسەر نووسیبوو بۆیە وای بەسەرهات. بێینەوە سەر هەمان باس هەردو نان وئاوو دانیشتنمان لێحەرام بوو. زۆرم بەزەیی پیادا هاتەوە. مامۆستا مەجید رەنگی تێکچوو وتی: کورە فریام کەوە ئەم قاتە جلە کوردیە کۆنەم لەبەردایە، وابچمە بەردەمی بەڕێوەبەری پۆلیس دەمکات بەکیوا. منیش وتم: کاکەگیان خوا پەکناخات.. قاتێکی تازەم کڕیبوو تەنها دوجارم لەبەر کردبوو، دام پێیەو خۆی گۆڕی. خۆمان تێکنەدا پێکەوە چووین بۆسەرای قەرەداخ کەخۆمانمان پێناساند لەوێ کاك مەجیدیان جیاکردەوە، منیش پەژارەو تاسە بردمیەوە. لەبەرچاوی خۆم کەلەپچەیانکرد بەدو پۆلیسی سوارە بەرکێشیانکرد بەرەو سلێمانی. یەکسەر گەیاندبویانە لای بەڕێوەبەرایەتی گشتی پۆلیس، ئەم وەك تاوانباریك لێی روانرابو. دوای کورتە لێکۆلینەوەیەك لەگەڵ ئەوراپۆرتانەی لێیدرابوو رەوانەی شاری بەغدادیان کرد ئیدی لەوخوارانە خرایە زیندانەوە ماوەی پتر لە ساڵێکی رەبەقی خایاند. سەردەمێك کەچوومە سلێمانی بیستم کەکاك مەجید بەربوە. منیش چووم بۆلای پیرۆزبایی ئازاد بوونیم لێکردو دەستمان کردە ملی یەکتری. کاکە مەجیدی خۆڕاگر دوای ئەو هەموو کێشەو سزا یەك لە دوای یەکانە، تێی روانیم و وتی: کاکە ئەحمەد بەداخەوە جلەکانی تۆم ئەوساڵە کە پێتدام وەك بیجامە لەبەردابوو کەڵکیان پێوە نەماوە دەمەوێ بۆت بژێرم. منیش وتم: کاکە مەجید هەرخۆت خۆشبی هەزار قات جل وشتی تر بەقوربانت بێت. مادام بەسەلامەتی هاتیتەوە هەموشتێکە بۆمان، دەبێت ئێمە شتی باشتر بۆتۆ بکەین. ئیتر داوای گواستنەوەم کرد لە قەرەداخەوە بۆناو شاری سلێمانی. کاتێ فەرمانەکەم بۆدەرچوو لەگەڵ دەورو تەسایم

دا رادیۆ بۆریشم دابە بەڕێوەبەری نوێی قوتابخانەی قەرەداخی سەرەتاییو هیوای کامەرانیم بۆخواستن ومالئاواییم لێکردن بۆسلێمانی، لەوێ لە قوتابخانەی عەبدول ئیلاهی سەرەتایی جێگیر بووم وگۆڕانکارییەکی نوێ بەسەر ژیانمدا هات. لە لای من هیچ شوێنێك بەقەدەر سلێمانی خۆشنەبووەو خۆشنابێت، سلێمانی دڵە گەورە زیندوەکەی کوردستانە. ساڵانی ١٩٤٥/١٩٥٠ گواسترامەوە بۆ قوتابخانەی عەبدولئیلاهی سەرەتای کوڕان لە نێوان هەردوو گەڕەکی سەر شەقامو شیوی قازیدا لە سلێمانی. مرۆڤ ئەبێ راستی بڵێت کە پەیوەندیم کرد بەو قوتابخانەیەوە کە خانویەکی گەورەی دوو نهۆمی بەرزی ئەهلی بوو، ئەمەش گەڕایەوە بۆ کاراییو لێوەشاوەیی مامۆستای کەم وێنەو پەروەردیاری هەرە خەم خۆرو بەسەلیقە جەنابی عەلی موزەفەر .. ئەو مامۆستایەی لە نزیکی ئەو بوایە بەختەوەر دەبوو، چونکە بەشێوازێکی سەرکەوتوی هاوچەرخ فێرە مامەڵە دەبوو. لەبەر ئەوە مامۆستا عەلی موزەفەر یەکەم کەسو دوا کەسو بۆ هاتنو رۆیشتنەوە بەرەو ماڵەوە. ئەوەی لەوێ مامۆستا بوایە لە کاتی دەوامدا نەیدەزانی دانیشتن چییە، بەڵکو بەوانە وتنەوەو راژەو پیشەی دەستیو هونەریو وەرزشەوانەوە بەشداری چالاکانەی دەکرد. ئەو قوتابخانەیە لەو شوێنە میللیە دواکەوتوەدا ببوە، مەشخەڵێکی پرشنگدارو ناو بانگێکی چالاکی پەیدا کرد. هەمیشە پێشانگای دڵڕاکێشی تیا بەرجەستە دەکرا. باخچەیەکی دڵگیرو حانوتێکی خاوێنی تیابوو، هەمیشە سەر پەرشتی دەکران. قوتابی نەدەبوو لە کاتی ئاوخوادنەوەدا دەم بنێت بە بەلوعەوە، بەڵکو کارێکی واکرا بەلوعەکە ئاوەکەی هەڵدەداو دەچوە ناودەمی قوتابیەکەوە. هەرچی لە بارەی رێکو پێکی عەلی موزەفەرەوە بوترێت کەمە. لەو رۆژگارەدا ئەم مامۆستایانەم لە یادە: عەلی موزەفەر، عومەری پۆتێ، یوسف زەیتون، سەید موحسین سەمین خۆشنوس، بەهجەت سەعید کابان، نوری شێخ رەزا، بەهنام حزوری، ئەنوەر فەخری، عیزەت تاهیر، محەمەد عەزیز، عومەر عەبدولڕەحیم، حسین ساڵەح غەفور، ئەحمەد ساڵەح موسڵی، مەحمود محەمەد ئەولی، قوتبەدین زەینەدین، بەشیر داود عەلەکە.. خاوەنی بینای قوتابخانەکە کەسایەتی شار جەنابی کاکە عومەر ئەفەندی سام ئاغا بوو، تابڵێی دڵسۆزوو بەڕێز بوو. کاکە عومەر یەك دوو خانووی تریشی هەبووو. لە بیرمە جارێکیان ئیدارەی قوتابخانەی ئاگادار کرد کە پێویستمان بە بیناکە هەیە، بەڵکو بۆمان چۆڵ بکەن.. ئیدارە

بەبێ دەنگی مایەوە ئەوە بوو بەشەخسی تەشریفی هێنا بۆ قوتابخانە، پێشوازیمان لێکردو لامان دانیشت. روانی ئێمە خەریکی رێخستنی حانوتەکەو جوان کردنی دیوارەکان بووین، فەرمووی: حەی حەی ئێوە خەریکی چینو منیش چیم مەبەستە، کورد واتەنی (خلە بار ئەکاو بلە کەپر ئەکا) .. ئیدی گفتو گۆمان درێژە پێداو وتمان: لەبەر ئەوەی ژمارەی قوتابییەکانمان لە زیادبووندایە تکات لێدەکەین لەبەر بەرژەوەندی منداڵانی گەڕەك خانوەکەی پشتەوەمان بدەیتێ تا بیخەینە سەر مەکتەب.. ئەویش زەردەخەنەیەك گرتیو یەکسەر بڕیاریداو ئێمەیش دەرگایەکمان خستە نێوان هەردوو بیناکەوەو سوپاسی دڵنەرمیو هاوکاریمان کرد. کاکە جەلالو کاکە شەماڵی عومەر ئەفەندی لای ئێمە ئەیان خوێند لەبەر ئەوەی پەروەردەی خێزانێکی دڵسۆز بوون ئەوانیش هەمان رێگەیان گرتەبەر. جارێکیان لە بەردەم حانوتەکەدا راوەستا بووم جەلالی عومەری سام ئاغا کە زۆر بچکۆلەو خوین گەرم بوو. ئەیویست شت بکڕێت هەرچەنی دەکرد دەستی نەئەگەیستە لای فرۆشیارەکان، منیش کردمە باوەشو بەرزم کردەوە، دە فلسی پێبوو دای بە حانوت چییەکانو بایی ٤، ٥ شیرینی کڕیو دامگرت ئینجا باقیەکەیان دایەوە. منیش دامە دەستی .. وتی: ئەفەندی گیان نامەوێ بەسمە ئەوەی ماوەتەوە بۆ خۆت یان بیدە بە تەلەبەیەکی تر. هەر لەسەر خاوێنیو وریایی کاکە جەلال خوا دەست بگرێ بە عومرییەوە.. رۆژێکیان ئاگاداریان کردین کەجەنابی موتوسوریف (عومەر عەلی) ئەیەوێ سەردانی چەند مەکتەبێك بکات. گورج خۆمان ئامادە کرد. ئەوەندەمان زانی سەیارەیەك هاتە بەردەم دەرگای مەکتەب، عومەر عەلی دابەزیو ئێمەیش منو عەلی موزەفەر بەخێرهاتنمان کرد. من لەوکاتەدا شاغیرم هەبووو، هاتە حەوشەوە سەری لە خاوێنیو رێکو پێکی حەوشەو باخچەو حانوتو تەوالیتەکانو بەلوعەکانی ئاوخواردنەوە سڕما، وتی: ئافەرین بۆخۆتان.. ئینجا دەستی کرد بە سە ردانی پۆلەکلن لە یەکەمەوە هەڵی بژارد. لە پۆلێکیاندا کە عەلی موزەفەرو منیشی لەگەڵدا بووین کەمێك سەیری دەرسەکەی کردو ئینجا پرسیاری کرد. قوتابیەکی خاوێن خنجیلانە کە جەلالی عومەری مام ئاغا بوو لە پێشەوەدانیشتبوو، هەلیساندو ئاماژەی بۆ وێنە هەڵواسراوەکە کردو وتی: ها کوڕم ئەوە کێیە.. ؟ جەلال وتی: ئەفەندی ئەوە مەلیکە.. وتی: ئافەرین ئینجا لێی پرسیەوەو وتی: ئەی ناوی چییە؟ جەلال وتی: ئەفەندی نازانم .. ئیتر عومەر عەلی

بەعەقلێکی ساویلکانەوە پەستو قوشتی بوو. دەستی دا بەرەحلەکەدا بە عەرەبی وتی: **المدرسة التی طلابها لایعرفون إسم ملکهم، لا أبقی فیها..)** ئیتر بێ خواحافیزی بەتورەیی چووە دەرەوە، هیچی دەربارەمان نەکرد. هەر لەوبارەیەوە: جارێکی تر عومەر عەلی چوو بوو بۆ سەردانی قوتابخانەی غازی سەرەتایی لە تەنیشت قوتابخانەی شێخ مەحمودی ئێستا، بەڕێوەبەرەکەی مامۆستا مەجید سەعید دزکوژ بوو.. سەرنجی چورەکانی دابوو، روانیبوی لە گەنجەنینە (مخزن) وێنەی مەلیك فەیسەڵی دوەم لە سەر عەرزەکە دانراوە.. هەردوو چاوی پەڕیبوە پشتی سەریو وتبووی: چۆن رەسمی مەلیك بەم شێوەیە دەپارێزرێتو دادەنرێت؟ بەخێرایی بڕیاری دەرکرد مامۆستا مەجید سەعید دزکوژی گواستەوە بۆ قەزای قەڵادزێوبەڕێوەبەری قوتابخانەی قەڵادزێی هێنایەوە لەجێی ئەو داینا. ئەم گواستنەوەیە هەڵەیەکی زەق بوو، بەهەر حاڵ بائەم دوو بیرەوەرییەش بچنە پاڵ ئەوانی تر.. ئەو ساڵانەی لە قوتابخانەی عەبدولئیلاهی سەرەتایی بووم لە ئەزمونی پەروەردەییو ژیان پتر شارەزا تر بووم. بەڕێوەبەری پێشەنگو لێهاتوو، هاوڕێی مامۆستای بەتواناو راهێنانی قوتابی بۆ جۆرەکانی یاسا ئەمە خۆی لە خۆیدا مژدانە بەخشە بەدەرونی مامۆستا، بیرەوەریی زۆرن، بەڵام وا روبەڕوی دوانی کاریگەر دەبمەوە:

**یەکەم:** ساڵانی ١٩٤٩/١٩٤٨ شارەزایەکی پەروەردەیی لە شێوەی نوێنەردا بە قوتابخانەکاندا دەگەڕاو راپۆرتی تەباییو سەرکەوتنو سەرنەکەوتی نێوان مامۆستاو قوتابیو ئیدارەو هەردو لایانی تۆمار دەکرد، وابزانم ئێستا هات لە بەردەم پۆلی یەکەمدا راوەستا بوو مامۆستا عەلی موزەفەرو بەندەش ئامادەبووین بە ئینگلیزی لە مامۆستا عەلی موزەفەری پرسی: ئەمە پۆلە یان هۆدەی چۆڵە؟ مامۆستا عەلی موزەفەریش وتی: بێگومان ژووری چۆڵ نییە پۆلی یەکەمەو بێدەنگنو نوزە یان لێوە نایەت، وتی: ئەو مامۆستایەی لە سەریانە کێیەو ناوی چییە؟ وتی: مامۆستا سەید موحسینی خەتاتو خاوەن زەبرو زەنگە منداڵ لە ترسی ئەو ناجولێتەوە.. کابرای شارەزا هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی: جەناب ئەمە پێچەوانەی پەروەردەو فێرکردنە چۆن دەبێت پۆلی یەکەم نەجولێنەوەو قسە نەکەن.. مەهێڵە بچێتەوە پۆلەکەیان با منداڵەکان سەر بەستی جمو جوڵو وتەو گۆرانیو یارییان هەبێت ئەگین داهاتوو گلەیی لەو مامۆستا دڵڕەقە دەکەن.. وادیارە ئێوە شارەزای پەروەردەی ئەوروپی

نین.. لیێت ئاشکرا بێت سەردانی پۆلی وا ناکەم کە دیلو داماوبن، دەنگی لیۆە نەیەت ئیتر بە پەستیەوە چووە دەرەوە.

**دووەم:** هەر لە هەمان قوتابخانە بەشێك قوتابی جولەکە (موسایی) مان هەبوو و لە گەڕەکی جولەکانەوە دەهاتن بۆ دەوامکردن. من لێپرسراوی دەرمانخانە بووم، ئەگەر روداوێك بقەومایە زۆربەی قوتابییە بریندارو نەخۆشەکان خۆم چارەسەرم دەکردن یان حەبو دەرمانم پێدەدان.، چونکە دەرمانخانەی قوتابخانە لە سایەیدا کۆشی بەڕێوەبەرەوە تابلێی دەوڵەمەند بوو، وارێکەوت منداڵە جولەکەیەکی پۆلی یەکەم هەردوو چاوی تێکچوو بوو هێنایان بۆ لام تاکو تکەی بۆ تێبکەم منیش: پەلە پەلم بوو یەکەم جاریش بوو توشی واهەڵەی زەق ببم ئەمەندە وتی: ئەفەندی چاوم دێشێ‌و قسەی بە بەرا هێنا منیش پەمپی قەترەکەم بەدەستەوە بوو. چەند شوشەیەك لە دەرمان دانرا بوون، لە (یۆد) بۆتیمار کردنی برینو پرتۆ گوڵ بۆ تەعقیمی چاو لە تەنیشت یەکەوە لە بری ئەوەی پەمپەکە بکەم بەناو شوشەی قەترەی چاوەکەدا کردم بەناو شوشەی تەعقیمیبریندارو یەکدوو دڵۆپم کردە چاوی راستیو ویستم بیکەمە چاوی چەپیشی منداڵەکە دایە زریکەو لنگە فرتێ وتی: ئەفەندی بەسە کوێر بووم تێینەکەی.. منیش کە سەرنجمدا چاوی راستی بوبە دڵپی خوێنو بۆم دەرکەوت هەڵەیەکی زلەم کردوە بەپەلە سەریم دایە بەر بەلوعەکە. روانیم ئەو فرمێسکەی بەچاویدا هاتوەتە خوارەوە تەنانەت رومەتیشی سوتاندوە.. بێئەوەی ئیدارە ئاگادار بکەم کوڕەکەم کردە باوەشو بردم بۆ خەستەخانە نزیك بوو لامانەوە کە بەرامبەر مزگەوتی شێخ حسێنی قازی بوو لە سەر سەقام دوایی بە خەستەخانەی زارا بەناوبانگ بوو. برین پێچێکی مەسیحی لێبوو، کوردی نەدەزانی ، کە سەیری کرد وتی: ئەمە ترسناکەو چاوەکانی لە دەست داوە.. منیش بەو هەواڵە ناخۆشە ترسم لێ نیشت هەرچۆنێ بوو نەختێ بۆمان پاکردەوە هێنامە دەرەوە وتم: ئەتوانیو ئەزانی بڕۆیتەوە؟ وتی: بەڵێ ئەفەندی شارەزام.. کەڕۆشتمەوە گەیشتمەوە قوتابخانە بەخەمناکی ساتەکانم لێدەرێشت. بۆ بەیانی ئیدارە مامۆستا کانم ئاگادار کرد وتم: گەر نەیشیلێم هەر دەیزانن.. ئەوانیش وتیان: لەوە دەچێت بگیرێیتو بتدەن بەدادگا. رۆژی دوایی لە منداڵێکی دراو سێیان هەواڵم پرسی: منداڵە وتی: خەریکە چاك دەبێتەوە دایکی وتی: دوسبەی دەینێرمەوە، منداڵەکەم ساڵانە ئەم نەخۆشیەی

چاوی لەگەڵ دایە. ئیتر هەندێ تەسکینیم بۆ هاتو لە ناو مامۆستاکاندا دەمم گەرم بوو. کەمنداڵە هاتەوە بە دوو چاوی گەشەوە هێنامە ناو مامۆستاکانەوە وتم: خوا بتانگرێ شوکر هیچی لێنەهاتو خۆی دەڵێت مامۆستا تینی بینینی چاوەکانم لە جاران بەهێز تر بوە.. بۆ خۆشی وتم: ئەگەر ئێوەش گەرەکتانە چاوتان بەهێز بێت وەرن باواتان بەسەر بهێنم. لە راستیدا هەرچەند بیر دەکەمەوە خوا نەخواستە ئەگەر ئەو منداڵە چاوی لە دەست بدایە لەوانەبوو هەر بە ئازارەوە بمایەتەوەو رێچکەی ژیانم بەکوێرەوەرییەوە بگرتایەتە بەر. ژیانم لە قوتابخانەی عەبدولئیلاهیدا لەوپەڕی گەشەو کامەرانیدا بووززئیستاش بەم تەمەنەوە کە رێم بکەوێتە ئەو گوزەرەوە ئەو یادەوەریانە دەکەونەوە خەیاڵو بیرم.

## بەرەو قەزای چوارتا

سالآنی ١٩٥٤- ١٩٥٥ رەوانەی چوارتا کرام. پێش من ئیدارە بە دەست مامۆستا سەعید زەکییەوە بوو، لێرەشدا دوو هاتنی باشو خراپی عومەر عەلی دەخەمە روو:

**یەکەمیان:** ئەوبینایەی کە من لە مامۆستا سەعیدم وەرگرت تازە بوو چەندانمانگی بەسەردا تێپەڕیبوو، قۆنتەراتچییەکە حەمەی فەرەج ئەفەندی بوو.. بیناکەی باش دروست نەکردبووو. دیوارەکانی ناوکاری کەم تێدابوو.. روانیمان بەردە نقارییەکانی پێشەوەی هەرەسیان هێناو بەرە بەرە روخان. منیش جەنابی قائیمقام بایز عەزیز دەزەیی بوو، ئاگادارم کرد کە تەشریفی بێت لە روداوی مەکتەبەکە بڕوانێت. کاتێ کە هات زوو گەڕایەوە، خێرا عومەر عەلیو موتە سەریفی ئاگادار کرد بۆ بەیانی هاتو بانگی منی کرد بۆ مەرکەزەکەو بە توڕەییەوە وتی: جەنابی مودیر لەسەر چی ئەساسێك ئەم بینایەت وەرگرتوە ئەبێت سزاو لێکۆلینەوەت لەگەڵدا بکرێت، وتم: گەورەم منیش هاتم پێش من مامۆستا سەعید زەکی بەڕێوەبەر لە قۆنتەراتچییەکەی وەرگرتوە. بەڕێکەت چەند رۆژێك لەمەو پێش سەعید زەکی بەرەحمەت چوو بوو.. فەرمانی دەرکرد ئەبێ بەزوترین کات دەسگیر بکرێو تۆڵەی لێبکرێتەوە. پۆلیسەکان هاتنەوەو وتیان: قوربان: : دەمێکە ئەو مدیرە مردوە.. عومەر عەلی بەدەنگێکی بەرز بەعەرەبی وتی: **طلعوا من البقر** تامحاسەبەی بکەم.

**دوەمیان:** لە مەڕ ئەم هاوکارییە چاکەیەوە:

ساڵ هاتو رۆژی بڕیاری ئیستیعرازێکی تایبەتیو گشتیماندا. قوتابیانمان رێخست، کەشافەو یاریزان، جۆرەکانی تری وەرزشی ئامادە کران. پێش ئەوە بەنوسراوێك قائیمقامو موتەسەریفمان ئاگادار کرد، بەڵکو گۆڕەپانێك بۆقوتابخانەکە دروست بکەن.. بۆ ئەم کارە عومەر عەلی پێی باش بوو، هاوکاری کردین. هەرزو بیلدۆزەرێکی بەسایەقەوە بۆ ناردین.. چاڵو چۆڵیو قەد پاڵەکانمان باش تەختکرد. تابوو بەگۆڕەپانێکی خنجیلەو چاك.. ئینجا بانگی متەسەرریف عومەر عەلیو قائیمقام بایز عەزیز دزەیز (ئاغا) وبەڕوەبەری معایف (ساڵەح سەعید) و سەر پەرشتیاری وەرزشی (ساڵەح عەلی) و بەڕێوەبەری ناحییەکانو دانیشتوانی دێهاتە نزیکەکان هاتنو بەشداری سەیرکردن بوون ئیستیعرازەکە ئەوەندە نمایشی سەر سوڕ هێنەری تێدا بوو لە لایەن متەسەریفەوە هەموویان مەدالیایان بە دیاری پێدرا.. سوپاسی زۆرمان روبەڕو بوەوە.. هۆی سەرەکی سەرکەوتنمان هاوکاری متەسەریف بوو.. پتر لە چوار پێنج ساڵە لە چوارتا مامەوە.. ساڵ بەساڵ بە هاوکاری مامۆستا بەڕێزەکان نەوەی چاكو هۆشمەندمان پێشکەش بە کۆمەڵگە کرد. لەو مامۆستا بەڕێزانە: ئەنوەر فەخری واسف، فەرەیدون عەلی ئەمین، شەوکەت عەلی بەگ، کەمالی میزا غەفور، محێدینی ئەمینە سور، سەعید زۆرا ساعور (مەسیحی) ، ئەوەی ناخۆش بوو لە لام مامۆستا کاکەی فەلاح کە گەنجێکی هۆشیارو شاعیرو روناکبیر بوو، لە کاتی ئیستیعرازەکە دیار نەبوو بەداخەوە گیرابوو. دیسانەوە بەرەو سلێمانی.. ساڵانی ١٩٦١/١٩٦٠ گواسترامەوە بۆ قوتابخانەی ئاشتی لە سلێمانی، کە بەڕێوەبەرەکەی مامۆستای پایە بەرزو هاوڕێی بە ئەمەکم مامۆستا بەهجەت سەعید کابان بوو.. ساڵی دوای ناوەکەی گۆڕا لە ئاشتیەوە بۆ زێوەر.. خۆم بوومەوە بە بەڕێوەبەر. (زێوەر) لەجێگای ئێستا قوتابخانەی رەفیق حیلمیدا بوو.. تا توانیم خزمەتم بەم قوتابخانەو ناوە جوانەکەیەوە کرد. ساڵی داهاتوو ١٩٦٣/١٩٦٢ رژێم بەلیستێکی زاڵمانە لەبەر هەڵوێستو بیروباوەڕ چەندان مامۆستای نەفی خواروی عێراقی کرد لەوانە: عیزەت تاهیر بۆ حیللە، حەسیب شێخ ئەحمەد بۆ رومادیە، عەبدوڵڵا ئەژدەر بۆحیللە، محەمەد ساڵەح سەعید بۆ عەمارە، ئەم سیانش (ست ئامینە محەمەد، ست شەمسە فەقێ، ئەحمەد سەعید مەولوود) بۆ شاری کوت.. وەکو وتمان لە کۆتایی ١٩٦٢دا

بەپەژارەیەکی زۆرەوە رەوانە کراوەکان بەرێکەوتین‌و لە بەغداد لاماندا‌و ماینەوە بەدوای رێگە چارەدا ئەگەڕاین. بۆ بەیانی چووینە وەزارەتی معاریف تاکو لە دادمان بپرسن، بەداخەوە هیچ وەڵامێکیان پێنەداینەوە. هەندێ لە فەرمان بەرەکانی دەیان وت: بچن بۆ سەردانی دائیرەکانی ئەمن‌و ئیستیخبارات بەشی شارەکەتان وەڵام لە لای ئەوانە. لە مشتومڕی خۆماندا نەگەیشتینە ئەنجام، بۆیە دوای بیرکردنەوە بۆ خۆم بڕیارمدا چووم بۆ لای کاك تایەر حەیدەریی خزم‌و دۆستم. ئەو دەم قائیمقامی کازمییەبوو. کە بینیمی گەشایەوە، کە پێموت گواستراوەمەتەوە بۆ باشوور خەفەتبار بوو. جگە لەوەش دڵشکاوی خۆی نیشاندا بەوەی کەڕژێم حیسابی بۆ نەکردوەو کچەکەیان بۆ شوێنێکی هەرە دوور لە بەغداد هەڵداوە، کەنە ئەبوو وابێت.، بەڵام لەبەر دڵی من وتی: باتەلەفون بکەم بۆ جەنابی قائیمقامی ئەعزەمییە کە ئەمەکدارو راستگۆیە، دەستی زۆر ئەڕواو ناسیاوی چاکی هەیە. یەکێ لەوانە متەسەریفی کوتە.. لە تەلەفونەکەدا تێی گەیاند کەئەحمەد سەعید مەولوود کەسی نزیکمەو شایانی ئەوەیە لای لێ بکرێ تەوە. تکایە نامەیەکی پیا بنێرە بۆلای جەنابی متەسەریفی کوت هەتا لە جێگایەکی نزیك‌و لە بار دایبنێ. دوای ئەم گفتوگۆ برایانەیە کاك تایەرم بەجێ هێشت. گەشت مە لای قائیمقامی ئەعزەمییە ئەمەندەی ریز لێگرتم لە حاڵی خۆم تەریق دەبوومەوە. ئەم پیاوە زۆر سادەو میوانپەروەر بوو چیرۆکی رەوانە کردنی خۆمانم بۆ گێڕایەوە، کاغەزێکی دەرهێناو قەڵەمێکە دامێ وتی: چی دەنووسیت لە بەرژەوەندی خۆت بەناوی منەوە ئامادەم بۆت ئیمزا بکەم. وتم: گەورەم شتی واناکەم دەبێت جانابت چەند دێڕێك بنووسیت. ئەویش دەستی پێکردو لاپەڕەیەکی بەنووسین رازاندەوەو ختیە زەرفێکەوە داینەخست، دای پێم.. گەلێك سوپاسی هەستی گەرمی مرۆڤانەیم کرد. ئەو شەوەش لە بەغداد مامەوە شتێکی تریش ئیحتیانم هات بەخەیاڵداچووم بۆ لای مامۆستای بەرێز عەزیز محەمەد، کە بەرێوەبەری گشتی دیراسەی کوردی بوو لە بەغداد.. کە بەو شێوەیە منی بینی خەم دایگرت. بردمی بۆلای فەرمانبەرێکی کوردی دەست رۆیشتوو، کە خۆیشم تۆزێکم دەناسی پێی وت: رۆژێکەو ئەمرۆ شتێکی بۆ بنوسە بۆلای متەسەریفی کوت کە زۆر پەیوەندیتان پێکەوە هەیە، بەڵکو نامەکەت جێگەی خۆی بگرێت. کابرا (ناوی نابەم) لە پۆستێکی بەرزدابوو بەبێگاری چەند وشەیەکی بۆ نووسیم‌و ختیە زەرفێکەوەو

دایخستو ئیمزای لەسەر کرد. ئەویشم خستە گیرفانمو ئینجا چوومە سەیارەو بەرەو کوت ڕۆیشتم. لە ڕێگادا لەگەڵ دومامۆستای ئافرەتدا بێدەنگو دڵتەنگ کاتەکانمان لێدەڕۆیشت. هەر لەبیر کردنەوەی ئەوەدا بووین تۆ بڵێی لە جێگەیەکی شیاو نزیك دامان بنێنو توشی کێشەو گێچەڵی دوژمنان نەبین.. کاتەکانمان بەئیشەوە لێدەڕۆیشت. لە دڵی خۆمدا وتم: نامەویٚ چاوم بەمتەسەریفی کوت بکەویٚ، بەڵام وەکوناچم بانامەکان بخوێنمەوە. کەنامەی قائیمقامی ئەعزەمییەم خوێندەوە بڕوا بکەن خۆیشم دانیشم شتی وا پوختو ڕەوا بۆ خۆم نانوسم. هەزاران ئافەرینم لێکرد. کەچی نامەکەی (.. .) ی کابرای لای خۆمان کە پلەکەی لەو بەرزتر بوو دەبوایە هەر لەبەر خاتری کاك عەزیز محەمەد، جگە لەوەش کەخۆشمی دەناسی شتێکی ڕێکو پێکی بنووسیایە.. منتازە ناوی نابەم. لەگەڵ خوێندنەوەیدا بەبێ ئەوەی ناومی بردبیٚ تەنها ئەم دەربڕینە کاڵۆ کرچو ترسنۆکانەیەی نووسیبوو: (**حامل الرسالة التمس مني والحّ عليَّ أن اكتب هذهِ الرسالة لسیادتكم وشكراً..**) خوێندنەوەی نامەکان خستمیانە جۆریٚ پێزانینو جۆریٚ ترسنۆکیو چاڵ هەڵکەندن. یەکەمیان پڕ لە سەروەریو دوەمیان شەرمەزاری. ئەوە بوو پەستی دایگرتم دەموت: ڕوت ڕەشبیٚ زەمانە ئەم فس فس پاڵەوانانە وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچن بیٚ ئەوەی کەس بیان ناسیٚو نەفرەتیان لێبکات، لە دڵی خۆمدا دەموت تۆ بڵێی دنیا هەروا بڕوات ئەم ناکەسانە بیٚ بەر پرسی بیخۆنو بیخۆنەوە. گرنگ ئەوەیە مرۆڤ دۆستو ناحەزی خۆی بناسێت. کاتەکان بەسەر چون ئێمەش کە سیٚ کەس بووین گەیشتینە کوتو دابەزین بۆ ڕۆژی دوایی من بڕیارمدا بچم دیدەنی بەڕێوەبەری معاریفی کوت بکەم بێگومان هەر لە سەعاتهەشتی بەیانیەوە لەویٚ ئامادە بووم بۆ نیوەڕۆ هەڵم بۆ هەڵکەوت کە بیگەمیٚ. سەرەتا ویستم تەقەی لەگەڵدا بکەم ئەو دەستی درێژنەکرد.. هەر چۆنبوو تێم گەیاند کەسیٚ کەسین بالە ناوچەیەك دابنرێین بەتایبەتی دوو مامۆستا ئافرەتەکە بالە قوتابخانەیەکی ناوشار یان لە نزیك شاربن. وتی: بەیانی وەرنەوە بۆ وەڵامەکەتان. بەیانیش بەهەمان شێوە دەستم کەوت، ئەو بەڕێوەبەرە تابڵێی نەگریسو ناکەس بەچەو لوت بەرز بوو. چاوی کوردی نەئەبینی، ڕومانکردە خۆیی سەرەتایی فەرمانی کارگێڕیەکەیان پێداین هەریەکە بۆ شوێنێکی دوورو دواکەوتو دانراین. ئەوانم لەبیر نەماوە بۆ کویٚ چون، بەڵام من بۆ (**مدرسة الامام الابتدائیە**) دانرام. بەیانی زوو

ئامادە بووم پرسیارم ئەکرد، بارەکە ئالۆزە کەس نیئەزانی ئەو مەکتەبە کەوتۆتە کوێوە. وەکو بۆم دەرکەوت ناوچەیەکە ناوی تایبەتیو دروستکراوی خۆی هەبووو، کە پێیان ئەوت (**بيت عطا الله**) دۆزیمەوەو بەهەزار مەشەقەتو پرسیار گەیشتمە مەکتەبە بۆر، مەکتەبی چی؟ بینایەکی ناخۆشی بێ سیاجو مەرجەکانی تەندروستی تیا نەبوو. لە شوێنێکا بوو هەرگیز دڵی تیا نەئەکرایەوە. مەکتەبەکە دەوری چۆڵبوو. سێ مامۆستای تیابوو وابزانم لە دانیشتوانەکە پێشکەوتوتر نەبوون، یەکێکیان بەڕێوەبەر بوو، سەلامم لێکردو دوو دەقیقەی نەبرد وتی: هەستە وەرە لەگەڵم بۆ ناو پۆل دەرس بڵێرەوە.. خۆ ئەگەر نازانیت بامن دەرسێکت بۆ بڵێمەوە تۆیش چاو لە من بکەی. منیش لە بێ چاوو روییو ساویلکەیی ئەو سەرم سڕماو وتم: بڕۆ پێویستم بەتۆ نییە خۆم دەرس ئەڵێمەوە. وردە وردە خۆم لەگەڵیان راهێنا، تێکەڵبوونم لەگەڵ مامۆستاکان کەم بوو ئەوان نەفسیەتیان سوك بوو، من خۆم لەو مەکتەبە ناخۆشو چۆڵەدا ئەمامەوە جار بەجارێ سەردانی شاری (کوت)م ئەکرد. ئەو خواردنانەی پێکەوە بۆ نیوەڕوان ئەمان خوارد کە سێ مامۆستا عەرەبەکە ئیدیعای گرنگیان بۆ ئەکرد، خوا بیبڕێ پێیان ئەوت (مرگە هوی) بریتییە لە شلەیەکی لیڵ هەر قاپی سەلگێ پیازی تیابوو تامەکەی زۆر ناخۆش بوو بەناچاری بۆم ئەخورا.. کەچی ئەوان نانیان تێئەوشیو بەو چنگە چەپەڵەیان هەڵیان ئەلوشی. هەریەکەمان بۆ نیوەڕۆ تەنیا نانێکمان ئەهانین. ئەم چیانە تەنگەم بەتاسەو پەژارەوە لێئەڕۆیشت، قوتابییەکان ژمارەیان ئەگەیشتە شەست کەس. لە مەکتەبەکەدا دوو کوپە (مەرکانە) ی ئاو خواردنەوە هەبووو.. لای یەکێکیانەوە بۆ تەوالێت دانرابوو.. جار بەجار ئەو دۆلکانەی ئاوی پێدەخورایەوە ئەکەوتە میزاوەکەوە.. ئاوەکەیش لە رووباری غەرافەوە دەهێنرا کەپڕ بوو لە قوڕو گژوو گیاو شتی تر تەبیعەت وەری نەدەگرت. لەبەر ئەوە چووم بۆ کوت لە سەیدەلیە هەندێ زاخم کڕیو بۆ جامێ ئاو کەو چکێ چاییم تێدەکردوو لیتەکانی دەنیشاند. ئینجا دەم خواردەوە، ئەوەی سەیر بوو مامۆستا عەرەبەکان پێیان دەوتم خڵتەکەی فڕێ مەدە دەمانەوێ ئێمەیش دەیکەینەوە ئاوەوە تاکو بەتەعقیم کراوی بیخۆینەوە. خڵتەکەش بۆ ئەوان باشە. دوای دوو سێ هەفتە لە لایەن (**شيخ العشيرە**) وە بانگکراین بۆ دەعوەتو نان خواردن. سێ عەرەبەکە دەتوت رۆن سەگ لە قەلبیان دەدرێ، ئەمەندە خۆشیان بوو. کە گەیشتینە

سەریفەی میوان داری شێخ العشیرە بەکەش‌و فشێکەوە هات مامۆستاکان وەکو بەندە ئەو وابوون.. دوای تەوقەو دانیشتن‌و بەخێرهاتن وتی: پێم بڵێن کامەیە مامۆستا تازەکە.. وتم منم. وتی: خەڵکی کوێیت؟ وتم: کوردم‌و خەڵکی سلێمانیم.. زۆر سەیر لە هەڵوێستێکی چاوەڕوان نەکراو روانیم دەستی بەرز کردەوە بۆلای سەری تەق تەق دایدی بەمێشکی خۆیداو وتی: ئێوە قەومێکن عەقڵ‌و دەماختان نییە!! هەموو پێکەنین، منیش زۆرم لا ناخۆشبوو.. وتم: لەبەرچی میللەتی کورد بێ دەماخە؟ ! وتی: لە شیمال مەلا مستەفای بارزانی باخ‌و دارستان دەبڕێ‌و دەسوتێنێ دام‌و دەزگا کەی دێهات‌و شار دەڕوخێنن‌و دزی‌و کوشتار دەکەن... منیش لەوپەڕی پەستیدا بووم، خواردنم لەبیر چووەوەو لە وەڵاما وتم: یا شێخ **(أنت متوهم)** واتا بەهەڵە داچویت خراپ تێگەیەنراویت.. ئەوەی تۆ دەیڵێیت لە شیمال شتی وا لە لایەن ئەوانەوە نەکراوە.. تۆ بۆ چی باسیان دەکەی بۆ من.. من مامۆستایەکم هاتوومە دێیەکەتان بۆ ئەوەی منداڵەکەتان فێری خوێندن‌و نووسین بکەم چیم داوە لە سیاسەت؟ ئیتر هەردوولا بڕیمانەوە.، بەڵام مامۆستاکان‌و خەڵکەکە هەڵوێستەکەی منیان بەلاوە گرنگ بوو تا ئەوکاتە هیچ کەس نەیورابوو لە ئاستی بکۆڵێ. کەنان دانرا، خۆم خەڵەفاندو هیچم نەخواردو زوو گەڕامەوە بۆ مەکتەبەکە. مامۆستاکان بەهەڵەداوان هاتن بۆ لام .. رەنگیان هەڵبزرکابوو، وتیان! کورە بۆ نانت نەخوارد (شیخنا) عاجز بوە لێمان، هاوار بە ماڵمان چی بکەین: شێخ شێخی ئێوەیە هی من نییە ئێوەش مامۆستان سنوری خۆتان بزانن. بۆ زیرەتان کردوە ئێوە لێرە نامێننەوەو قسەتان لە روی نەکردوە رەنگتان تێکچووە، خۆ لەگەڵ پیاوەکانیان هۆسەو هەڵپەڕکێ‌و هیتافتان کێشا بۆ دەترسن.. کەچی من لە روی قسەم کردو لێرەش لەم مەکتەبە چۆڵە بەتاقی تەنیا دەمێنمەوەو ناشترسم.. .. ئەو رۆژگارانە وادەژیام.. خوا دەلیلی داماوە. رۆژێکیان (مفتش) پشکنەر هات ناوەکەیم لەیاد نەماوە، لامان مایەوە هاتە دەرسەکانمەوە کە دانیشتین لە منی پرسی وتی: ئاخۆ لێرە ئاسودەیت مەکتەبەکەت بەلاوە چۆنە؟ وتم: بەڕێز ئەوە بەڕێوەبەرو ئەوە مامۆستای تر، بۆ چی لە سەرەتاوە منت هەڵبژارد پرسیارم لێبکەی؟ . پشکنەرەکە وتی: کاکە لە مەعاریف ئیزبارەکەی تۆم دەرهیچناوەو خوێندومەتەوە تێگەیشتوم چەند کاراو شارەزایت لە ئیدارەو بەڕێوەبردنی قوتابخانەدا. هاوڕێ عەرەبەکانم حەپەسان، منیش وتم: من کوردم بەڕاستی

وەلاًمت دەدەمەوە: بەڕاستی ئەم قوتابخانەیە مەرجی تەندروستی تێدا نییە.. سیاجی نییە، دەرگای رزیوەو پەنجەرەکەی شڕو شوشەی پێوە نەماوە. ئەو ئاوەی بۆ منداڵان تەرخانکراوە لە رووباری غەرافەوە دەیهێنن پڕ لە قوڕو میکرۆب. تەنانەت ئەو دوو مەرکانەیەی ئاوەکەیان تێکراوە پیسن. یەکێکیان بۆ تەوالێت بەکاردێت بۆنی میزو ئاو ئاوێتە بوە. من زاخ بەکاردێنم ئەگەر کار وابڕوات ئێرە دەبێتە کانگای نەخۆشی. پشکنەرەکە تەوقەی لەگەڵ کردمو هەستا دەورو خولێکی ناوەوەو دەرەوەی مەکتەبەکەی کردو راپۆرتی نوسیو سەزەنشتی بەڕێوەبەرو مامۆستاکانی کرد. بەلامەوە سەیر بوو لە بەرچاوی ئەوان وتی: گوناحە تۆ لێرەیت با مژدەت بدەمێ تۆ نقڵبوویت (**مدرسة العزة المسائیه**) لە ناو ناوەندی کوتدا کەواتە بابڕۆین. کە چووم بۆ مەعاریف فەرمانی گواستنەوەکەم وەرگرت شتێکی چاکتربوو، لەسەر رێنماییو بڕیاری بەڕێوبەرێتی دیراسەی کوردی لە بەغداد هاتبوو کە بگوێزرێمەوە بۆ خانەی مامۆستایانی بەسرە تاکو وانەی کوردی بڵێمەوە.. زۆر شادمان بووم. بێگومان ئەوسا بەگوێرەی یاسا دابڕان لە قوتابخانەی شارێك بۆ شارێکی تر (١٠) رۆژ ماوەی پشوو هەبووو. منیش بە خۆمو فەرمانە ئیدارییەکەمەوە بەرەو سلێمانی رۆیشتمەوە... لەوکاتەشدا خەریکی خانوکردن بووم بە نیوە ناچڵی واتە سەقفم تێکردبووو بە ناچاری بە جێم هێشت. دوای بەسەر بردنی ئەو رۆژانە گەڕامەوە بەرەو شاری بەسرە.. ئەو دەمە شۆڕشی ئەیلول لە جۆشو خرۆشدابوو.. هاتنو رۆیشتنەوە بەقافڵە بوو.. بە گەیشتنم بۆ بەسرە چووم بۆ ئوتێلێکی چاك لەوێ نیشتە جێ بووم. لە بازاڕ هەندێ پێداویستیم کڕی. بەپرسکردن بینای خانەی مامۆستایانم دییەوە. بۆ بەیانی گەیشتمە ئیدارەکە خۆمم پێ ناساندن. بەڕێوەبەرەکەی ناوی مامۆستا (زکی الجابر) بوو هەتا بڵێی دڵسۆزو بەڕێزو خۆشەویست بوو. زۆر حەزی لە خزمەتو هەڵسوڕان بوو. بەندە بەسیفەتی مودەریس دانرام. کاتێ سەیری (جدول) خشتەی رۆژانەم کردو چووم بۆ ئەو پۆلەی وانەی کوردی هەیە، روانیم چۆڵ و هۆڵە. لە یەك دوو قوتابییم پرسی، ئێوە کوردیتان هەیە بۆچی لە دەرەوەن ؟ لە وەلاًمدا وتیان مامۆستا وانەی کوردی لای ئێمە ئەو بایەخەی پێنادرێ .. ... ناچار دووان دووان و سیان سیان کۆمکردنەوە، بە ماوەی چەند رۆژێك واملێکردن کە کەمتەرخەم نەبن لە وانەکەداو باسی گرنگی زمانم بۆ کردن.. پێم وتن سبەی ئێوە دەبنە مامۆستا لەوانەیە

هەندێکتان ڕێتان بکەوێتە باکووری وڵات (شمال) تاڕادەیەك پێویستیتان بە تێگەیشتن لە زمانی کوردی هەیە. وتراوە "زمان هاوڕێیە". ئیدی زۆربەیانم ڕاکێشا بەلای ئەوەی گوێ لە زاراوەکان بگرن و نەختێك خۆیان خەریك بکەن . یەکێ لەو ڕووداوانەی لە سەرەتاوە یەخەی پێگرتم، ئەمەبوو: لەو پۆلەی وانەی کوردیم تیا ئەوتەوە قوتابییەکی لوت بەرزو مڕوموج هەبوو بەفیزەوە لەسەر لاکتێبەکەی ئەڕوانی قاچی لەسەر قاچ دادئەنا.

یەك دوو جار ئاگادارم کردەوە باش دانیشێ، ئەو هەر دەیوت باش دانانیشم . منیش گەیشتە بینم و قیژانم بەسەریاو ئەم دەر بڕینەم بەزمانەکەی خۆی پێوت: (اگعد زێن أچربك چلاق کوردی سامع چلاق کوردی شلونه أدبك چلاق اخلیل بنصف الساحه..)) ئەمە بۆ ئەو گورزێکی گرانبو. ئینجا بەزۆر کردمە دەرەوە. کەدەوام تەواو بوو بەرەو ئوتێل ڕۆیشتمەوە سەرنجم دا قوتابییەك بەپاسکیل بەدوامەوە بوو.. لێم دوور نەدەکەوتەوە دەیویست قسەم لەگەڵدا بکات.. وتی: مامۆستا لەگەڵم سەرکەوە ، وتم: برۆ بەرێی خۆتەوە، چیت لێم ئەوێ؟! پێیوتم مامۆستا ئەو قوتابییە شەقاوەیەی کەتۆ دەرت کردە دەرەوە لێپرسراوە لە (اتحاد طلبة) سیخوڕی ئیدارەشە.. ئاگات لە خۆت بێت توشی زیانت ئەکات. منیش وتم: سوپاس بۆ تۆ ئیتر لێیداو ڕۆیشت. کەچوومەوە بۆ دەوام قوتابییە نالەبارەکە لە ژوورەوە بوو، لە پۆل دەرمکردەوە. هەتا بەڕێوەبەری خانەی مامۆستایان جەنابی زکی الجابر، ناردی بەشوێنمداو چووم بۆلای‌و پێی وتم: ئەبوسیروان ئەو خوێندکارە کێشەی چییە؟ منیش لە نووکەوە بۆم گێڕایەوە. پێی نیگەران بوو. وتی: بلێین چی ئێستاوەری ناگریتەوە؟ وتم: نەخێر، وتی: بەس ئەم جارە لەبەر خاتری من وازی لێبێنە. وتم: خاتری تۆم پێ ناشکێ.. کەچوومە پۆلەوە قوتابییەکە هاتەوە پێموت بڕۆ نوسراوێك لە (سیدر المدیر) ەوە بهێنە ئینجا ڕێگەت پێدەدەم.. خێرا ڕۆیشت نوسراوێکی بۆ هێنام و دامنایەوە. ئیتر گۆڕاو عاقڵبو. ئەم هەڵوێستەم بویە پەندێك بۆ ئەوانی ترو بەڕێوبەریش لە کۆبونەوەدا تیشکی دەخستە سەر بەرەبەرە لەگەڵ بەڕێوەبەردا نزیکبوومەوە. زکی الجابر پیاوێکی لێزان و پەروەردیارێکی بەسەلیقەبوو. حەزی زۆری بەهاوڕێەتی من دەکرد هەتا بلێی دەست ڕۆیشتوبو. قسەی سەری دەگرت نەدەگەڕایەوە. ڕقی لە درۆو ماستاوچێتی بوو. لەبەر ئەوە شارەزایم لە پیشەی مامۆستایی و ئیدارەداهەبوو جۆرە خۆشەویستی وناوبانگێکم لە ناخی دڵی ئیدارەو

ماموٚستایان و فەرمان بەراندا پەیدا کردبوو. لەم روەوە روٚژێك نامەیەکم لە سلێمانییەوە بوٚ هات کەکردمەوە و خوێندمەوە هەواڵی ماڵ و منداڵ و دوٚست و خزمانی تێدابوو .. لەگەڵ ئەو نامەیەدا تەبلیغێکی مەسرەفی عەقاری سلێمانی تێدابوو کەدەبوو لە روٚژی دیاریکرادا قیستەکەی حەواڵە بکەم. من سەر قاڵی خوێندنەوەو بیرکردنەوە بووم، لەو لامەوە ماموٚستایەکی هاورِێم خەڵکی بەسرە بوو سەرنجی منی دابو.. هەتا بڵێی بەویژدان و دڵسوٚز بوو..

هاتە پێشەوە وتی: ئەوە چییە وا مات بووی؟ وتم: نامەیەکە بە کوردی بوٚم نووسراوە، کەچی دەستی دایە تەبلیغەکەو خوێندیەوەو خستیە گیرفانی، روٚژی دوایی دایییەوە، کاتێ بووە سەری مانگ چووم بوٚ بانکی بەسرە، وتم: حەواڵەم هەیە .. کابرای فەرمانبەر پاش لێکوٚڵینەوە وتی: لەبەر چی!. وەرەقەیەکی دەرهێناو وتی: دوێنێش حەواڵەت بەرجەستە کردووە. بوٚ سلێمانی .. کە لێم روانی وەك وەفاو پیاوەتییەك، زانیم ماموٚستا عەرەبەکەی هاورِێم هەستاوە بەو کارە.. کە بینیمەوە لەبەر چی پارەکەت لە بری من دابوو؟ لە وەڵامدا وتی: من و توٚ براین توٚ لێرە غەریبی و مەسرەفی خوٚت لێرەو ماڵ و منداڵت لە سلێمانی بەسەرەوەیە، پێویستە منیش هاوکاریت بکەم.. هەرچەند هەوڵمدا بیدەمەوە نەچووە ژێری، بەڵام من هەر پێم قبووڵ نەدەکرا، بوٚیە دوا وەڵامی ئەوە بوو، ساڵێکی تر ئەگەر هەتبوو بمدەرەوە.

بوٚ ساڵی دووەم لە دیراسەدا خانەی ماموٚستایان بەبرِیارێك گوٚراو بوو بەپەیمانگەی ماموٚستایان هەر ماموٚستا (زکی الجابر) بەرِێوە بەرمان بوو. هەستم بەوە ئەکرد گەلێك دەربەستی ئاسودەیی منبو، بوٚیەبەشێنەیی لە هەلێکا لێی پرسیم و وتی: ئەبو سیروان توٚ لێرە ماڵت لەگەڵە یان نا؟ وتم: نەخێر لە فلان ئوتێل موقیعم.. سەرێکی باداو وتی: نابێت، لە مرِوٚوە ناچیتە ئەوێ برِوٚ کەلوپەلت کوٚبکەرەوە بیخەرە ناوتەکسیەکەوە یەکسەر بچوٚ بوٚ بەشی ناوخوٚیی (سەرەکی) خوێندکاران بەناوی منەوە ببە بەسەروٚکی بەشەکە. منیش بەقسەم کرد. کاتێ چوومە ئەوێ شوێنێکی عەلاحەدەو خاوێن و نزیك هەموو پێداویستیەکی تێدا بوو.. جێگەو خوٚراك و ژیانی باشم مسوٚگەر کرد.

کارەکانم باش هەڵدەسوڕا. هەمیشە لە ناخی دڵمەوە سوپاسی هەستی پیاوەتی مامۆستا زکی الجابرم ئەکرد. ئەویش دەیوت هێشتا هیچت بۆ نەکراوە.

دامەزراندنم لە ناوخۆیی و بوونم بە لێپرسراوی بەشەکە بەهیمەتی ناوبراو، وەك دەگ دانەوەیەك وابو. زۆر مامۆستای سەڵت هەبوو ژیانی تەنگ و پڕلە زەحمەت بوو. بۆیە بوومە جێگەی سەرنجیان و ئێرەیی (بەخیلی) یان پێدەبردم. لەبەر ئەوە بێئەوەی بەخۆم بزانم کەوتبوونە شکاتکردن و چاڵ هەڵکەندن بۆم، هەموو جارێ مامۆستا (زکی الجابر) بەنوسراو پەکی هەوڵەکانی ئەوانی دەخست. بەم جارەدا بۆم دەرکەوت کاتێ سەرەی رۆیشتنەوەم بوو پێی وتم: ئەبوسیروان ئەم نامەیە لەگەڵ خۆت بەرە بۆ **(مديرية التعليم المهني)** بیدەرە دەست شەخسی مدیر. منیش وتم: بەسەر چاو کەگەیشتمە بەغداد، دابەزیم نامەکەم دا بە مدیرو کەمێك لای مامەوە. مدیر روی تێکرم وتی: کاکە وەڵاممان داوەتەوە.. بۆ وازت لێناهێنن؟ لە راستیدا نەم دەزانی بڵێم چی؟ کەتێبینیم کرد هەیهو لە شەهامەتی ئەو پیاوە.. تەمەس بەرگری کردن بوو لە من کە لە (داخلیە) ناوخۆییەکە دەرنەکرێم، ئەمجارە باشترین ئیشم بۆ کرابوو.. وەڵامی نوسراوەکە تەنها دێڕێك بوو هیچی تر: **(طالما يعمل فى المعهد فهو على ميلاك المعهد..))** ئیتر پڕ بەدڵ سوپاسی مدیرەکەو کردو کە گەڕاشمەوە دووبارە سوپاسی مامۆستا زکی ئەلجابرم کرد. کە لە بەشی ناو خۆیی ئەمامەوە لێپرسراوی ئەو بەشی بیناکە بووم گەلێ جار توشی گێرەو کێشەدەبووم بەهۆی تەلەفۆن کارییەوە جارێکیان وەڵامی لێپرسراوێکی حیزبی تەلەفۆنی بۆ کردم کەدوانزە قوتابی کوڕی چاکی بۆ بنێرم منیش وتم: نازانم هەموو کوڕی باشن نەم زانی ئەو کوڕە باشەی ئەو مەبەستێتی بەعسی ساغ بوە.. بۆیە سەرزەنشتبارو شکات لێکراو دەرچووم.. ئەمجارەش مامۆستا زکی الجابر هات و کورە ئەوە قەومانوتە، بەڵام قەیناکە گوێ مەدەرێ. روداوێکی سەیرو رێکەو تێکی دڵتەزێن:

بۆ نیوەی ساڵ ویستم بڕۆمەوە بۆ سلێمانی، یەکێك لە هاوڕێ عەرەبەکانم کەکایتی معهد بوو بەناوی (حبيب جاسم) ەوە، وتی: ئەبو سیروان سپاردەیەك و نامەیەکت پێدەدەم کەگەیشتیتە کەرکووك تەلەفۆن بۆ ئەو ژمارەیەی سەرنامەکە بکە، دێن سپاردەکەت لێوەر دەگرن. وتم: باشەو گەڕامەوە بەرەو کوردستان، لە کەرکووك مامەوە، تەلەفۆنم بۆ ژمارەی دیاری کراوەکە کرد. تەمەس سپاردەو تەلەفۆن بۆ قائید فیرقەی چوارە.. وەڵامەکەی یەکسەر

پێگەیشتەوە ئەوەندەم زانی جێیێکی عەسکەری هات و داوای لێکردم لەگەڵیا بچم بۆلای قائید فیرقەی.. منیش وتم: پێویست ناکات ئەوە سپاردەکەیە بۆی بەرە. وتی: نابێت فەرمانی سەرەوەیە. کاتێك کەچوین هەر سەلام و تەحییە بوو بۆلای دەکرا. منیش بەئاسایی گەیشتمەلای. گەیشتە شوێنێکی ئاوا کارێکی ئاسان نەبوو. قائید فیرقەلەبەرم هەستاو بەخێر هاتنی گەرمی کردم. هەواڵی صبیح جاسمی پرسی . وتی: دیارە تۆ هاوڕێی خۆشەویستی ئەوی، کەواتە لە بەسرە لە کوێ دائەنیشی و باری ژیانت چۆنە؟ لە وەڵامدا وتم: گەورەم من کوردم و خەڵکی سلێمانیم گواستراو مەتەوە بۆ شاری بەسرە لەوێ دەرس ئەڵێمەوە. وەڵامەکەم سەرنجی راکێشاو وتی: ئەتەوێ بەیەکجاری بچیتەوە بۆ سلێمانی لە کۆڵ هاتو چۆو ماندو بوون بکەوی؟ وتم: بێگومان لە بەسرە ژیانم سەختە. موراسیلەکەی باگلکردو وتی: بڕۆ فلان قائید روی بانگ بکە.. خێرا هێنای و سەلامی بۆ کردو لە لای من دانیشت و پێیی وت: گوێ لێبگرە چی وت، دڵیمەشکێنەو بۆی جێبەجێ بکە. هەر لەو دەمەدا ئەفسەرێك هەڵە داوان هاتە ژوورەوەو بەقائید فیرقەی وت: گەورەم بەشی (اتصالات) بانگت ئەکات.

قائیدیش وتی: بەیارمەتی ئێوە ئێستا دێمەوەو ئینجاچوە دەرەوە.

من و قائیدە عەسکەرییەکەیشماینەوەو کەوتینە گفتوگۆ کەبۆم دەرکەوت لێپرسراوی گشتی فیرقەی چوارە. بەشێنەیی لێیپرسیم مەبەستەکەمی تێبگەیەنم. پێموت ئەگەر کرا نیازی گواستنەوەم لە دڵدایە لە بەسرەوە بۆ سلێمانی. کابرای لێپرسراویش لەبەر بەرژەوەندیی من وتی: کاکە بەتاقەیەك بروسکەی ئاسان ئەتوانم لە ماوەی کەمتر لە سەعاتێکدا هەموو کارێکت بۆ بکرێ و فەرمانی دەرچونی گواستنەوەت بۆ دەربچێ و بگەیتەوە شارەکەی خۆت.. بەڵام وەك برا پێت ئەڵێم ئەگەر کارەکەم ئەنجامدا بێگومان بەهۆی کاریگەریی ئەمن وئیستیخباراتەویە هاوڕێکانت گومانت لێ پەیدا ئەکەن و چاڵت بۆ هەڵئەکەنن بۆ تۆ خۆشنابێت.. لە سەرێکی ترەوە کەچویتەوە ئەمن و ئیستیخباراتی سلێمانیش ئەڵێن بازی بەسەر بڕیاری ئێمەدا داوەو قیست لێهەڵئەگرن. ئیتر کەیفی خۆتە، راستیەکەم بۆ روونکردیتەوە. ئەگەر رازیت ئەوا بۆت جێبە جێئەکەم .. وتم: من سوپاسی هەستی پیاوەتیت ئەکەم نامەوێ بەو جۆرە بگوێزرێمەوەو نیشانەی پرسیارم لەسەر دابنرێت،

پەنجەی تاوانباریم بۆ رابکێشرێت. لەو قسانەدا بووین قائیدە فیرقە خۆی کرد بەژووردا. روی زۆر خۆشبوو تەوقەی لەگەڵ هەردو کیاندا کردو وتی: (أبشرکم الآن وصلت قواتنا الباسله الی قلب بارزان واحتلنا..) واتا سوپاسی عێراقی ناوچەی بارزانی داگیر کرد. بەو دەنگوباسە دڵتەنگ بوومو ئەم وێرا دەری ببڕم. ئەوان لە قریوەی خۆیاندا بوون، منیش مۆڵەتم لێخواستن کە بڕۆمەوەو رێگەیان پێدامو بەجێبێك گەیشتمەوە لای نقلیات. لەوێ بە قافڵە بەرێ ئەکەوتین..، چونکە لە تەقو تۆقی هێرشی پێشمەرگەی کوردستان ئەترسانو سڵیان ئەکردەوە. هەرچۆنێك بوو گەشتمەوە سلێمانی. کە گەڕامەوە بەرەو بەسرەو لەسەر کارەکەی خۆم بەردەوام بووم.. ئەوەندەمان زانی هەواڵی گواستنەوەی مامۆستا زکی ئەلجابر بلاوبووەوە، من بەو هەواڵە غەمگین بووم. بەهەر حاڵ بوو بە راست. کاتی دابڕانی لە پۆستەکەی ماڵئاوایی لێکردینو ئێمەش بەو پەڕی پێزانینو گەردن ئازادییەوە بەرێمانکرد.. هەڵوێستەیەکی کردو گەڕایەوە بەمنی وت: ئەبو سیروان سەرکەوە لەگەڵم ئیشە پێتە. منیش لەگەڵی رۆیشتم ئەو بۆ ماڵئاوایی ئەچوو بۆ لای مدیری معاریف، منیشی بردەلایو پێیوت: ئەم ملمۆستایە کوردە زۆر خۆشەویستو بەرێزە لام ئەبێت ئەوپەڕی یارمەتی بدەیت تا هەست بە غەریبیو بێکەسی نەکات. مدیر معاریفیش وتی: بەسەر چاو یەکسەر فەراشەکەی بانگکردو وتی: سەیری دەمو چاەی بکەو بیناسەرەوە هەرکاتێ ئەم زاتە هات ئەگەر لە کۆبونەوەشدابووم بۆی هەیە بێتە ژوورەوە.. سوپاسی هەردوکیانم کرد. ئەم پەیوەندیەم دنگی دایەوە. مامۆستا کوردەکانی هاورێم ئەوانەی ناویانم لە یادە وەکو: جەلالی محەی دگڵو کەمالی گۆگوڵ جان مکورجی (کەماله رەش) هەرچەند کاك کەمال لە بەغدا لای مدیر معاریف وتیەك بۆچی منیان نقلکردوە خۆمن دایکم تورکمانو باوکم رەگەزی هیندییە..) و عەباسی تۆفیق شلكو عەلی حاجی ئەحمەدی حەمامچیو ئەحمەد محەمەد لە سەناعەو مامۆستا سەمەد هەولێریو زۆر تر ناویانم لە بیر نەماوەو کەوتنە مشتو مڕ لەگەڵم. وتیان: وا سەری ساڵە ئەبێت لای مدیر معاریف واسیتەمان بۆ بکەیت لە کاتی تاقیکردنەوەی سەری ساڵدا نەمان کەن بە چاودێر، چونکە زۆر ئەخایەنێ. ناوەکانیان کرد بەلیستێك کەبیدەم بەدائیرەی معاریف.. ناچار لێم وەرگرتن چووم بۆلای مدیرو لای دانیشتم. لە بەرم هەستاو تەوقەو بەخێرهاتنی لەگەڵ کردم، وتی: چیت لە دڵدایە

پێم بڵێ؟ وتم: جەناب ئەم لیستەیە هەموو برادەرمنو خەڵکی سلێمانین ئەیانەوێ بەشداری چاودێری تاقیکردنەوە نەکەن. بەفەڕاشەکەی وت: بەرشێوەبەری خویی (**ذاتیە**) م بۆ بانگ بکە، کە هات پێیوت: ڕێنمایی تازەی تاقیکردنەوەکان چییە؟ چوو ئیزبارەکەی بۆ هێنا، تیابوو ئەبوایە هەموو مامۆستایەك بەشداری چاودێری تاقیکردنەوەکان بکات جگە لەو مامۆستا ئافرەتانەی پڕەو (حەوت مانگە) بەشداری ناکەن.. مدیر سەیرێکی منی کردو بەزەردەخەنەیەکەوە بە بەڕێوەبەری خۆیی وت: لەبەر خاتری ئەحمەد سەعید ئەفەندی تێکڕای ناوەکانی ناو ئەو لیستەیە حیسابی (حامیلە) یان بۆ دابنێ، نابێ بەشداری چاودێری بکەن، بەڵکو بڕۆنەوە بۆناو خزمو کەسو کاریان. ئیدی هەستامو سوپاسیم کردو چوومە دەرەوە. بێگومان لەسەر راسپاردەکەی زکی الجابر هەر ئیشێکم بکەوتایەتە لای جەنابی بەڕێوەبەری معاریف دەستی نەئەنا بەڕومەوە. لە یادمە لە سەرەتای حەفتاکاندا هاوڕێم مامۆستا بەهجەت سەعید کابان معامەلەی سەرپەرشتیاری لە وەزارەتی ناوخۆ مابوەوە بۆی نەئەکرا. پێموت: باپیاسەیەکی بەغداد بکەین لەوێ دۆستێکم هەیە یارمەتیمان ئەدات. لە بەغداد ماینەوە بۆ بەیانی سەرماندا لە وەزارەتی راگەیاندن و زەکی جابرم بینی و وتم: ئەم بەڕێزە (بەهجەت سەعید) معامەلەکەی لە وەزارەتی ناوخۆیە، وەڵامی نادەنەوە. یەکسەر تەلەفۆنی کردو وتی: ئیشی براکەت تەواو جێبەجێ بوو، وایزانی (بەهجەت سەعید) برای ئەحمەد سەعیدە کە خۆمم. کە چووین بۆ وەزارەتی ناوخۆ فەرمانی مامۆستا بەهجەت تەواو کرابوو.

بەکورتی پیاوەتی زەکی الجابر بۆ من زۆر بوو تائەم دواییانەش نامە گۆڕینەوە لە نێوانماندا بوو. کاتێ ناردیان بۆ بەغداد کردیان بە بەڕێوبەری ئیزاعەو تەلەفزیۆن.. لەوەو دواش لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٠دا بەوەزیری راگەیاندنی عێراق.. پاشان نێردرا بۆ تونس بوبە ئەندامی کاریگەری جامیعەی دوەلی عەرەبی. زکی الجابر ئەگەر چی بەعسی بو، بەڵام کەبینی سیاسەتیان بەرەو چەوتی و گرژبون ئەڕوات وازی لێهێنان و دانیشت. ئەو حەزی بەخوێن رشتن و زیندان بوونو داپلۆسین نەبوو. بێینەوە سەر باسی خۆمان. لە دوای زکی الجابر مامۆستا عبدالجابر عاشور کەشاعیرێکی دەرکەوتوی عێراقییە پۆستی مدیری مەعهەدی پێدرا. عاشور مرۆڤێکی روخۆش و قسە خۆشبوو. لە بیرو باوەڕدا لە قەومیە

(سەرفەکان) بوو. پەیوەندی لەگەڵ مامۆستاکاندا باشبو. ئیزبارەی منی خوێندبۆوە. رێزی تایبەتی بۆ دانابووم. لە درێژەی دەوامکردندا رۆژێکیان بانگیکردم و پێی وتم: ئەبوسیروان لەبەر ئەوەی پیاوێکی کاراو لێهاتوی من پێئەزانم لە ئەمڕۆوە ئەتکەم بەسەر پەرشتیاری کتێبخانەی پەیمانگە (مكتبە المعهد) ، بەمەبەستی ئەوەی لێرە ئەترازێیت. دوای سوپاس کردنم بۆ بەڕێزی حەسانەوەم چاکتر بوو. چووم بۆ کتێبخانەی گشتی بەسرە، لەوێ ئەم نامیلکە گرنگەیان بۆ دەستنیشانکردم کە بیخوێنمەوەو پەیڕەویی بکەم، کە (**كيفية تنظيم المكتبات**) - بوو لە دانراوی جۆن دێوی. پاش لێکۆلینەوەی وردم تیادا کرد. کەهاتمەوە لە نووکەوە دەستم کرد بەڕێکخستن و رازاندنەوەی کتێبخانەکە. مامۆستا عاشور پتر دڵی پێیکرایەوە. کار گەیشتە سەر ئەوەی کەپشکنەری زمانی عەرەبی هات.. سەیری کتێبخانەکەی کرد سەری سوڕما. لە بەر چاوی بەڕێوبەرو چەند مامۆستایەك بەدەنگی بەرز بەعەرەبی وتی: (**أول مرة أشوف هذا التنظيم في المدارس**) یەکسەر سوپاسێکی بۆ نووسیم کردی بەنمونەی سەرکەوتویی. تێبینیەکی برایانە: نزیك بەتاقیکردنەوەکانی نیوەی ساڵ بوو پرسیارەکانی کوردیم دانابو. ئەوەندەم زانی مامۆستا عەبدولجەبار عاشور هاتە ژوورەوەو وتی: قوتابیان زمانی کوردی لابراوە بۆتە ئیختیباری.. ئیدی قوتابییەکان چۆڵیان کرد. بەم هەڵسوکەوتەی ناڕەحەت بووم و لە دڵدا شکامەوە دوای چارەکە سەعاتێ مامۆستام بانگکردە ئەو لاوەو پێموت: جەناب ئەم هەنگاوەت پەروەردەی نەبوو ئەبوایە لە سەرەتاو بەمنت بوتایە نەك لەبەر چاوی من زمانەکەمان سوك بکەیت و ئاوا بەقوتابیان بڵێین. ئیدی تۆزی ماتبوو سەری هەڵبڕیو وتی: (سامحنی) لێمببورە هەق نەبوو ئاوا رەفتارێك بنوێنم. هەر بۆ خۆشی لە کۆتایی و چانی سەری ساڵدا سیروانی کوڕم لەگەڵ خۆم برد بۆ بەسرە تا پەیوەندی (مباشرە) بکەم و دوایی بێینەوە بۆ سلێمانی کەچوومە پەیمانگاوە مامۆستا عەبدولجەبار عاشوریش کوڕێکی هاوتەمەنی سیروانی کوڕمی پێبوو لەوێ دانیشتین هەردو منداڵەکە لە یەکتر نزیك بوونەوە ئەو بەعەرەبی و ئەم بەکوردی بۆ یەکتر ئەدوان و چونە حەوشەکە وەیاری تۆپ تۆپێنیان ئەکرد هەریەکە شتێکی ئەوت بەرامبەر ئەوی تر جوێنیشیان بەیەکتر ئەدا، بەڵام تێنەئەگەیشتن ئێمەش هەر سەرنجمان ئەدان و پێیان پێئەکەنین. پاش نیوەڕۆی ئەو رۆژە مامۆستا عاشور وتی: بابە خۆمان کوڕەکانمانەوە بچین

پیاسەیەکی (مینا) و فڕۆکە خانەی بەسرە بکەین.. کاتێ بەرێکەوتین و گەڕاین لە ناو فڕۆکە خانەکەدا فڕۆکەیەك خەریکی نیشتنەوە بوو سیروانی کوڕم بەدەنگێکی بەرزو چەپڵەلێدانەوە وتی: تەیارەکەی مەلایە لوقمانی کوڕی تیایە

من پێکەنیم و مامۆستا عەبدولجەبار عاشور وتی: ئەبوسیروان توخوا وتی چی.. منیش لە وەڵامدا وتم: لێت ناشارمەوە ئەم دەربڕینە لەسەر زمانی هەموو منداڵانی کوردەوارییە. واتا ئەم فڕۆکەیە هی سەرۆك مەلا مستەفای بارزانیەو لوقمانی کوڕی تیایە.. ئیتر دەستی کرد بەپێکەنین و وتی: قوڕ بەسەر منالەکانتان واتێگەیەنرابێت سوپای عێراقی چۆن دەرەقەتتان دێت و خەیاڵی خاوە. لە مەڕ دڵسۆزی مامۆستاوە شتێکی ترم هاتەوە یاد.

ساڵی ١٩٧٠دەورەیەکی گەورەی تێکڕایی زمانی عەرەبی کرایەوە عەبدولجەبار عاشور سەرۆکی دەورکە بوو لە بەغداد. کۆمەڵێ مامۆستاو مودەڕیس لە شارەکانی عێراقەوە بەشدارییان تیاکرد. یەکێ لەوانە نوری عەبدوڵلا (مدرس) مەلا نوری خۆمان بوو .. لەوێ کە ناونیشانی خۆی پێوتبوو، ئەویش منی کەوتبوۆوە بیر. وتبوی تۆ خەڵکی سلێمانیت ئاخۆ مامۆستا ئەحمەد سەعید مولود ئەبوسیروان دەناسی؟ مەلانوریش هاوڕێی و دراوسێین.. تابڵێی پیاوێکی باشەو خۆشەویست و دڵسۆزی پەروەردەو قوتابیانە. عەبدولجەبار عاشوریش وتبووی هێشتا کەمت لە راستی و مەدحی ئەو پیاوە چاکەدا باسکردووە زیاتری قابیلە. مادام هاوڕێتەو دراوسێتەو خۆشەویستی منیشە چیت پێویستبوو ئامادەم خزمەتت بکەم. دوای ساڵێك خوێندن هەوڵدان عەبدولجەبار عاشور لەبەر ئەوەی قەومی بوو گواستیانەوە بۆ بەغداد، مامۆستایەکی تر بەناوی (یەعقوب عەبدولوەهاب) کە خەلچکی زوبیر بو، چووە جێگەکەی. هەر چۆنێك ساڵێکی تری دیراسیمان لەگەڵ بەڕێوەبەری تازەدا بەسەر بردو لە زمەی لاوازیمان نەدا بەدەستەوە. هەمیشە سوپاس و ستایش ئەرکو ماندوبونی دەکردم. ژیان لە بەسرەدا لاپەڕەیەکی تری لە ناخی بیرەوەرییەکانمدا تۆمارکرد. چوار ساڵ مامۆستایی لەوێ ماوەیەکە کەم نەبوو. ساڵی١٩٦٧- ١٩٦٨تێکڕای مامۆستا دوور خراوەکان بەسەر مژدەدا کەوتین. ناوەکانمان کرا بەلیستێك و لە بەسرەوە نقڵی سلێمانیان کردینەوە. کردمان بەئاهەنگ و بۆ نەی پیرۆز. هەریەکە بۆ قوتابخانەیەك دانرا. مایەوە خۆم ئەو دەم مامۆستا (موساسەمەد) مدیری معاریف بوو.. چوومە لای و دوای بەخێرهاتنەوەم لە لایەن

جەنابییەوە. وتی: کاك ئەحمەد دەمێکە ئەفیکراوی بەخێر بێیتەوە. کردمی بە بەڕێوبەری قوتابخانەیەك، فریای دەوام نەکەوتم فەرمانی چۆڵکردنی دەرچوو گوایە زانکۆ لە سلێمانی دەکرێتەوە شوێنی ئەو مەکتەبەی کە منی بۆ دانراوە دراوە بەزانکۆ ئەبێت بەزوترین کات چۆڵی بکەین. لەبەر ئەوە مامۆستا موسا سەمەد وتی: بڕۆ بۆ گەڕەکی (ئازادی) خانوە قوڕەکان قوتابخانەیەکی سەرەتایی تێدایە کە عەسکەری داگیری کردوەو ئێستا چۆڵیان کردوە، کە قوتابخانەی (ئەزمەڕ) ی پێدەڵێن خێرا ئاوەدانی بکەرەوە. لەوێ کرام بە بەڕێوبەری چەند مامۆستایەکی تێکۆشەرو دڵسۆز کاروبارو پرۆسەی گرنگی خوێندنیان ئەبرد بەڕێوە. لەوانە (کەمال کوردی) کەئێستا مەکتەبەکە کراوە بەناویەوە. هەروەها مامۆستا (رەئوف زوهدی) و (عەبدوڵلا ئەژدەر) ... تاد... داخی گرانم بۆ ئەو پەروەردیارە راستگۆو بەئەمەکانە وەك مامۆستایان کەمال کوردی و رەئوف زوهدی بەناڕەوا تیرۆر کران.... یاخود ئەوانە بەمردنی ئاسایی سەریان ناوەتەوە. درود بۆ گیانی هەموو هەمویان.. تا دوا هەناسەم ناوی پیرۆزو کردەوەی جوانیانم لە یاد ناچێتەوە.

## هەندێ جار نوکتەش دروست دەبێت

ئەو سالانەی بەڕێوبەری قوتابخانەی ئازادی (کەمال کوردی) ئێستا بووم، هەمیشە بەسەر قوتابیاندا ئەسوڕامەوەو چاودێری دەوام و پێشکەوتن و دواکەوتنیانم ئەکرد. ئەوەی دوابکەوتایە محاسەبەم ئەکرد، ئینجا ئەمنارد بەشوێن باوکیدا تاکو لە بارەی دواکەوتنی منداڵەکەیوە گفتوگۆ بکەین. رۆژێکی زستان کابرایەك منداڵێکی هەڵفڕان و راوینا بۆ ناو قوتابخانەکەمان. کابرا بەجوێن و هەڕەشەوە ئەو ناوەی کاسکرد: ئەگەر بیگرم وای لێدەکەم نازانم خۆیکرد بەکوێرا؟ منیش لێم روانی جوتێ جراسەی قوڕاوی لە پێدایەو شپرزەییەکەی لە ئەندازە بەدەر بوو. بەرەو پیری چووم لێم پرسی کاکە بۆچی وادەکەی؟ وتی: ئەگەر ئەو حەرام زادەیەم دەگرت خۆم دەمزانی چی حەسیر بەمەیدانێکم پێدەکرد؟ وتم: چی کردوە وتی: چۆن دواکەوتوە لە مەکتەب وتم: تۆ باوکی ئەو قوتابییە بوویت کەناوی فلانە.. وتی: بەڵێ وتم: وەرە ژوورەوە پشویەك بەخۆت بدە، کاتێ لام دانیشتو لە هەناسەبڕکێ بووەوە، وتی:

قوربان لەبەر هەژاری لەوەو پێش خۆمکردوە بەسەرباز ئێستا خانە نشین کراوم و مانگی سێ دینارم هەیەو حەوت سەر خێزانین لەبەر تەنگە دەستی بووم بەشاگردی نانەوا رۆژی بە ١٠٠فلس هەر دەری ناهێنێ ئەم هەتیوەش وادوا دەکەوێ و منی خستە ئەم گۆیەندەوە..
وتم: وتم کاکە گیان خوا یارمەتیت بدات و قەناعەت باشە.. ئینجا بەهێمنی وتی: سوێندت دەدەم توخوا مامۆستا ئەو پارەیە ئەوەنیە بەشی حەوت سەر خێزان بکات، بۆ نمونە تۆو خێزانەکەت رۆژانە هەر گووبخۆن گووبخۆن، ئاخۆ ئەو پارەیە دەری دەهێنێ بۆ مەسرەفات..
وتم: نەخێر دو خواردنیش گرانە.. ئینجا ئارەقی شەرم دای گرت کەچی و وتوە وتی: دەبێ دەستت ماچبکەم خۆم گوو ئەخۆم.. وتم: قەینا کاکە گیان ئەبێ گوخواردنیشمان بەر بکەوێ.. ئیتر بەشەرمە زاری و پەشیمانیەوە رێگەی ماڵەوەی گرتە بەر پەیمانیدا سزای منداڵەکانی نەدات. شایانی باسە سەدان بەسەر هات و رووداوی سەیر سەیرو نووکتەی سەرنج راکێش رووبەڕووم بووەتەوە. ئەگەر تێکڕایان بیربکەونەوەو بیان گێڕمەوە ئەڵبەتەسەرتان دیشێنن و زۆر دەخاێنن. دوساڵ لەوێ مامەوە. دوایی بەپۆستی بەڕێوبەری دیسان ناردمیان بۆ قوتابخانەی (ئەمین زەکی) .. تاساڵی ١٩٧٢، لە ئەیلولی ئەو ساڵەدا لەسەر خواستی خۆم خانەنشین کرام.

لەوەدوا بە دوکانداری و بازرگانییەوە تاکو ئەمڕۆ ٢٠٠٥/١٢/٢٨خەریکم. کەدێمەوە شوێنکارەکەم و پشوودەدەم. هاوکاری و سەرپەرشتی نەوەکانم دەکەم لە هێنان و کڕین و فرۆشتنی راخەری بایەخدار.. ئێمەلای خۆمانەوە لەسەر بەرنامەیەکی پوختی داڕێژراو فەرش بەقیست دەدەین بە فەرمانبەران. هەردەمێ هاوڕێیەکی دێرینی خۆم دەبینمەوە یان دێتە پێشاگاکە دەکەوینە ئاخاوتن و هێنانەوە یادی رۆژانی تێپەڕبوومان. لەو ساتانەدا هەناسەی خەمناکی هەڵ ناکێشم، بەڵکو وادەزانم سەرلەنوێ لە دایك بوومەتەوە.. رابردو زۆر خۆشە بەمەرجێ بەویژدان وردەکارییەوە وەك خۆی بیگێڕیتەوە. لە خوا بەزیادبێ مێشك و دروستیم باشن. بەم تەمەنەوە کەزۆربەی زۆری هاوڕێکانم بەجێیان هێشتووم لە دنیادا نەماون سەر گوزەشتەکان لە خەیاڵ و لە بەرچاوانمدا دیارن، هەتا پێمکرابێ دڵی هەموو لایەکم راگرتووەو وشەی گونجاوو رێزم پەیرەو کردووە.

# پاشکۆیەك لە بارەی گۆڕینی ناوەوە

بەندە (ئەحمەد سەعید مەولوود) کەئەم نامە بەهەڵە لە سەرم کەوت، ئەبوایە ئەحمەد سەعید ئەحمەد مەولوود) بوایە، ئەوە بوو لەسەر ئەیتی کۆن کەنێرا مەکتەبی دوەم ۱۹۳۰/۱۹۳۱ ناوەکەم، باپیوی لێپەڕی و بویەکێشەیەك بۆم. دەفتەر نفوسی۱۹۳٤یش بەهەمان شێوە ناوەکەمی تیا تۆماکرابو. ئیدی لە هەموو پێناس و تۆمارەکانی قوتابخانەشدا هەروا مایەوە. ساڵی۱۹٤۷ویستم راستیبکەمەوە کەخۆم مامۆستا کەمال محمد ئەمین (سوسە) لەو هەڵمەتەدا بەشداربوین و لە بەکرەجۆوە سەر بەئێمە بوو بەداخەوە هیچم بۆ نەکرا.. مایەوە بۆ سەر ژمێری ساڵی۱۹٥۷دیسان لە هەمان هەڵمەتدا بەر ناوچەی شار باژێڕکەوتم لیژنەکەلەم کەسانە پێکهات و ئەرکەکانیان بۆ دەستنیشانکرا:

١) حاکم عبدولقادر، کەلەوەو پێش نوسەری دادگای شارباژێڕ بو، کرا بەنوێنەری یاسایی..

٢) ئەحمەد سەعید مەولوود، مامۆستاو بەڕێوبەری قوتابخانەی چوارتا.. نوێنەری دائیرەی سەرژمێری بوو.

٣) جەمیل محەمەد (جەمیلی چایچی) نوێنەری بەشی ئەهالی بوو. ئەو سیانە، خۆمان و پێداویستیەکانەوە پێکەوە بووین. دێ بەدێ ئەگەڕاین، چی راستی بوایە ئەوەمان ئەنووسی، چونکە وایان پێ سپاردبووین. ئەو هەڵمەتە مانگو نیوێکی خایاند. کەچی ناوەکەی من لە سلێمانی هەر بەهەڵەکەی جاری جاران تۆمار کرایەوەو بویە ناوبانگم . ئیتر بێ هیوا مامەوە، کاتێ لە چوارتاوە گواسترامەوە بۆ سلێمانی، سەرەتای۱۹٦۱ڕۆیشتم بۆ دادگا بەتەواوی ناوەکەم بگۆڕم بۆ هەڵەکە. سکالآم نوسی تۆماری کۆن و بەڵگەنامەم پێبوو.. کاتێ بانگ کرامە ژوورەوە هاوڕێی خۆشەویستمباوکی دکتۆر بەرهەم، جەنابی حاکم ئەحمەدی حاجی سالحی قاسم بەر پرسبوو، پێی وتم: کاك ئەحمەد چۆنی چاکی، خێرە ئیشت کەوتۆتە ئێرە؟ ! لە وەڵآمدا وتم: قوربان ئەمەوێ ناوە چەوتەکەم بچەسپێنم، چونکە وەڕس بووم هەر بۆم راست نەبووەوە. حاکم ئەحمەد زەردە خەنێك پەڕییە سەر لێوەکانی و سەرنجی دام بەبەختەوە وتی: برام تۆ مامۆستایت و هاوڕێی دێرینمی، نەکەی وازبهێنی، واچاکە

حساب بۆ داهاتوو بکەیت، ئەگەر ناوە هەڵکەت سەربگرێ و تۆ پێی قایل ببیت ئەڵبەتە دوزیانت لێئەکەوێت:

**یەکەم:** تۆ لە خزمانت دائەبڕێیت، ئەمە ناخۆشەو ڕەوا نییە.

**دووەم:** لەو هەموو مومتەلەکاتەی باوك و باپیرانت کەهەتانە بێبەش ئەبیت، بێگومان ئەمەیش ماف خواردنە، غەدرێکە لە خۆتو نەوەکانتی ئەکەیت. ڕێنماییەکەی پەڕییە دڵمەوە ویستم ئەوپەڕی داکۆشی بکەم لەبەر ئەوە چووم بۆ دائیرەی معاریف ئەو دەمهاوڕێم مامۆستا مەحمود تۆفیق خەزنەدار بەڕێوەبەری خۆیی بوو.. بابەتەکەم بەدرێژی بۆ باسکرد، ئەویش وتی: مامۆستا ئەحمەد تازە کار لە کار ترازاوە ئەو هەموو پێچراوەو سەرژمێری و بەڵگەنامەوە زۆر زۆرەکانی دائیرەکان لە ناوەکەتەوە تێکرا بە ئەحمەد سەعید مەولوود تۆمارکراون ئەمە سەر بەرەو ژوورکەیەکی هەرە گرانو ئەستەمە، بەتۆ چارەسەر ناکرێ وازی لێ بهێنە.. ئیتر نەختێ نائومێد بووم ئەوەندەی نەبرد لە لایەن ڕژێمەوە کۆمەڵێ مامۆستا بەفەرمانی دائیرەی معاریف نەفی خواروی عێراق کراینو بەتەواوی کێشەکەم خستە لاوە.. ئەوەبوو ساڵانی ١٩٦٧- ١٩٦٨ پێش گواستنەوەم لە بەسرەوە بۆ سلێمانی ڕێکەوتێکی چاوەڕوان نەکراو ڕوویدا.. لە پەیمانگای مامۆستایانی بەسرە وانە بێژو لێپرسراوی کتێبخانەی ناو پەیمانگاکە بووم، لەوێ ناو بانگم بە شارەزایی ڕۆیشتبوو. بەڕێوەبەری پەیمانگا منی مخەوەل کرد لە وەرگرتنو وەرنەگرتنی گشت قوتابیە دەرچوەکانی پۆلی پێنجەمی ئامادەیی.. لە لیژنەکەدا قسەی منی ئەخوارد. ڕۆژێکیان ڕێم کەوتە دائیرەی معاریف لای بەڕێوەبەری خۆیی لە بەرم هەستاو بەخێرهاتنێکی گەرمی لێکردم، پێی وتم: تکایەکی برایانەم لێتە، بەڵکو هەوڵبدەیو یارمەتی کوڕەکەم بدەی تاکو لە پەیمانگای مامۆستایان وەربگیرێ مایەی سوپاسو شانازیمە. وتم جەناب من چیم بەدەستە؟ لە وەڵامدا وتی: (**إني أعرف بك**) شارەکە ئەتناسن خۆزگە دڵت نەئەشکاندم وتم: بابزانم خوا گەورەیە. کاتێ کەوتمە سەر تێبینی ناوەکان روانیم کوڕەکەی زیرەکەو لە ئەوائیلەکانە بلێمو نەلێم وەرگیراوە.. کەڕێم کەوتەوە بۆ لای وتم: بەڕێز، کوڕەکەت وەردەگیرێ... دوای چەند ڕۆژێك ڕاستیەکەی بۆ دەرکەوت ناوی کوڕەکەی لە سەرەتای لیستی وەر گیراوەکانەوە بینی. ئیدی زۆر سوپاس گوزاربوو. پێی وتم ئەمەوێ خزمەتێکت بکەم.. منیش وتم: سوپاس پێویست

ناکات.. وتی: نەبووەو نابێت چیت هەیە لێم مەشارەوە. وتم: جەناب لە سەرەتاوە ناوی من (ئەحمەد سەعید ئەحمەد مەولوود) بووەو تاکو ئێستا بەم هەڵەیە (ئەحمەد سەعید ئەحمەد) بڵاو بۆتەوە، بوەتە ئێشێکی دەرونی مێشکەو دڵی گرتومەتەوەو توشی هەندێ زیانم ئەکات. وتی: کاکە تۆ وێنەیەك لە دەفتەر نفوسەکەت بگرەوەو سکاڵایەکی پیچوە ببەستەو بمدەرێو هەقت نەبێ. من وەك شتێکی ئاسانو ئاسایی دام پێی. تەمز ئەو بەجدی لەگەڵ کێشە رۆیشتبوو. سکاڵاکەو وینە لەبەر گیراوەکەی پێشکەش بە ئەنجومەنی وەزیرانی کار گێڕی شاری بەسرە کردبووو. ئەوانیش لێیان کۆلیبووەوەو بڕیاریان لەسەر راستکردنەوەی ناوەکە دابوو بە (ئەحمەد سەعید مەولوود) .. ئیتر تەعمیم کرا بۆ هەموو وەزارەتەکان بەتایبەتی ناوخۆوو معاریفو ئەنجومەنی راژەو دائیرەو پەیمانگەو شوێنە تایبەتیو بەر پرسەکان. منیش بەو مژدەیەی کەبووبە بەرگی هەمیشەی دڵم چووم سوپاسی جەنابی بەڕێوەبەری خۆیی بەسرم کرد.. کە رەوانەی سلێمانی کرامەوە ناوەکە چەسپا بە ئەحمەد سەعید مەولوود ناسراوە. پێش کۆتایی.. مامۆستا سەعید مەولوود کە یەکێکە لە پەروەردیارە هەڵکەوتوو سەر کەوتوەکانی شاری هەڵمەتو قوربانی بیرەوەریی تری بایەخداری زۆر لە دڵو دەروندا حەشارداوە ئەوە هەڵدەگرێت کە کتێبێکی سەر بەخۆی لێ پێکبهێنرێت. هیوای لەش ساغیو تەمەن درێژی بۆ ئەخوازین.. لە دوا وشەدا فەرموی: یەکەم دامەزراندنم ساڵانی ١٩٤٢/١٩٤١ بوو موچەکەم نزیکەی ٨. ٧٥٠ (هەشت دینارو حەوت سەدو پەنجا فلس بوو.. بۆ ئەو رۆژە زۆر زۆر بوو. کە رەوانەی شاری کوت کرام لەوێ مانگی ٢٤ (بیستو چوار دینار) م وەر ئەگرت. کە هاتمەوە بۆ شارەکەم سلێمانی موچەکە گەیشتە ئەو پەڕ کە ٩٨ (نەوەدو هەشت دینار) بوو. کاتێ خانەنشین کرام لە معاریفدا موچەکەم باڵابوو.. ئەمڕۆژانەیش کە تەمەنم نزیك بە نەوەد ساڵ ئەبێتەوە، بەختەوەرم کەخاكو نەتەوەم لە بەرگی ئازادیدا گەشە دەکەنو ئاواتە خوازم هەرێمی کوردستان بەناوچە دابڕاوەکانی ترەوەو بە پارچە داگیر کراوەکانی ترەوە یەك بگرێتەوە بۆ کوردستانی سەربەخۆ.

# خۆزگەم بەو دەمانە

## شێخ مەحمودی حەفید

رۆژنامەی ئاسۆ، ژمارە (٢٠٨) ٢٠٠٦/٤/٩

سازدانی: ئەحمەد حسێن

لە کۆتایی رۆژەکانی دووەمی (٢٠٠٦) دا بەخزمەتی مامۆستا ئەحمەد سەعید مەولوود گەیشتمەوە ئەم جارەیان هەندێ پرسیارم لە بارەی بیرەوەرییەکانی سەبارەت بە مەلیك مەحمودی نەمر لێکرد، ئەویش بە شێنەیی وتی: لەبەر ئەوەی بنەماڵەی ئێمە خۆشەویستی شێخی گەورە بوو، بە تایبەت مامم مامۆستا (مستەفا بەهجەت) و باوکم لەبەر ئەوە چەندان جار بەخزمەتی ئەو پیاوە هەرە دڵسۆزەی کوردو کوردستان گەیشتوومەو رێزی لێناوم، تا دەمێنم شانازی بەو رۆژو کاتە گەشانەوە دەکەم کە لە خزمەتیدا هەناسەی بەختەوەریم هەڵمژیوە. ئێستا ئەم چەند یادەوەرییە کەتەمەنیان بۆ نزیکەی (٦٧ /٦٨) ساڵ دەچێت لە ناو دەمارەکانی جەستەمو کانگای دڵو مێشکمدا هاتوو چۆ دەکەنو بەسەرمایەیەکی گرنگی تەمەنم دەزانم جارێ هەر ئەوەندەیان لە یادە. شێخ مەحمود وەك زمانە وانێك: جارێکی دی پێموایە ساڵی (١٩٣٩) بوو، کە گەیشتینە خزمەتی روانیمان لەسەر دۆشکەیەك دانیشتووەو دوو سەرینی پەڕ لە ملاو لەولایدا دانراوەو پاڵی داوەتەوەو گۆڤارێکی گەلاوێژی بەدەستەوە بوو پەڕەکانی ئەم دیوو ئەو دیو دەکرد. وتی: دەك بەخێربێن وەرن لامەوە دانیشن و تاقیتان دەکەمەوە، وتمان فەرموو ئامادەین، وتی: ئێوە هەردووکتان دەبن بەئەفەندی واچاکە لە پێشەوە لە ئەحمەد بپرسم ئەگەر زانیت گەلاوێژ مانای چییە ئەوە زیرەکیت، بەڵام ئەگەر نەتزانی ئەوا پێچەوانەیت؟ ! منیش لە وەڵامدا وتم: قوربان گەلاوێژ ناوی ئەستێرەیە درەو شاوەیە کەلەئاسماندا هەڵدێت، وتی: برۆ نەتزانی، ئینجا لە رەفیق چالاکی پرسی، تۆ دەڵێیت چی؟ وتی: گەورەم گولاوێژ ناوی ئەو گۆڤارە هەرە دڵگیرەیە کە بەدەستەوەیە، بەزەردەخەنەیەکەوە وتی: تۆش نتزانی ئەی هینی کوڕی هین. وتمان قوربان ئەی واتای چییە؟ لە وەڵامدا فەرمووی گەلاوێژ لە بنەڕەتدا واتایی گڕ هاوێژە دەماو دەم

بوەتە گەلاوێژ، چونکە ئەستێرەکە فرە گڕهاوێژو پرشنگدارە. ئێمەیش قەناعەتمان بەو بۆچوونەی دەربارەی بنجو بناوانەی گەلاوێژ کرد. شێخ مەحمودی نەمر پیاوێکی دەروونزانو سەرناس بووە. مامۆستا ئەحمەد سەعید مەولوود گێڕایەوە، وتی: سالآنی ١٩٣٩ ـ ١٩٤٠ سەردانی شێخ مەحمودی نەمرمان دەکرد، بەتایبەتی منو رەفیق چالاك، شێخ هەمیشە ئامۆژگاری دەکردین لەسەر سەعیکردنو راستگۆییو هەڵگری دروشمی کوردایەتی، جارێکیان وارێکەوت هەردووکمان غەریب ناوێکمان پێوەلکاو چووینە دیدەنی شێخ، کاتێ گەیشتینە خزمەتی لە بەرمان هەستاو بەخێرهاتنی کردینو لێمان ورد بووەوەو وتی: ئەحمەد تۆو رەفیق چالاك دەناسم، یەکسەر بەغەریبی هاوڕێمانی وت: هەتیو تۆ چاوت شۆرە بۆ هاتوویتە بۆ ئێرە؟ ئەمجارە لەبەر ئەحمەدو رەفیق چالاك قەیناکە رێگەت دەدەم، بەڵام جارێکی تر توخنی ئێرە نەکەویتەوە. دوای قەدەرێك هستاینو رۆیشتین لە رێگا بەغەریبمان وت شێخ لە خۆڕا وانالێت دەبێت شتێکت کردبێت. غەریب وتی: چیتان لێبشارمەوە ئەم بەیانییە چووم بۆ رابواردن لەگەڵ ئافرەتێکی سۆزانیدا بێ ئەوەی شێخ ئاگای لێم بووبێت. ئێمەش وتمان قوڕت بەسەر هەر بەدەمو چاوتا تۆی سووكو سەلیمی ناسیوەتەوە. بڕۆ ئێمەش هاوڕێیەتی تۆ ناکەین.

## ناهیدە شێخ سەلام وەك پێشمەرگەیەك

ساڵی (١٩٤١) کە شۆڕشی رەشید عالی گەیلان بەرپابوو، باری ناو بەغداد تێکچوو، جەنابی عەلی کەمال شێخ مەحمود ئاگادار دەکات هەلێك بەدەست بهێنێتو بگاتەوە کوردستان، ئەوەبوو سایەقەکەی کەناوی ئەحە خورشە بوو باوکی هونەرمەند جەلال کۆچەرو شەهید جەمال کۆچەر جێبەکەی ئامادەکردو بەو شەوە بەو پەڕی ئازایەتیو لێهاتووییەوە شەقام بەشەقامی بەغدادی بڕی بەناو ئەو هەموو بگرەو بەردەو تەقو تۆقەدا دەرچوو. کاتێ گەیشتنە ناوچەی گەرمیانو کەرکوك هەر سەرۆك خێڵو هاوڵاتیان بۆ پێشوازی لە شێخو دەست خۆشیان لە ئەحەی خورشەی دلێرو خەمخۆری دەکرد. دەنگو باسی هاتنەوەی شێخ هەموو شارو شارۆچکەو گوندەکانی کوردستانی خرۆشاند، کاتێ گەیشتنەوە شارو لەوێشەوە گەیەنرایە گوندی سیتەكو لە مەترسی رزگاری بوو، تازەو چانی سەری ساڵ دەستی

پێکردبووو خاتوو ناهیدەی شێخ سەلام (١٩٢٢-٢٠٠٥) قوتابی خانەی مامۆستایانی کچانو ئێمەش قوتابی خانەی مامۆستایانی ریفی کوران بووین لە بەغەداد. لەبەر ئەوەی ماڵیان لە تەنیشت ماڵی نەنکمەوە بوو دراوسێو ناسراوی گەڕەك بووین، ئێوارەیەکیان خاتوو ناهیدە بانگی کردمو وتی: کاك ئەحمەد، بەڵکو دوو کوڕی دڵسۆزی وەکو خۆت بانگبکەیتو بەنهێنی سپاردەیەکتان پێبدەم تا بیبەن بۆ سیتەك لەوێ بیدەنە دەست مەحمود ئەحمەد (١٩١٧-١٩٦١) ، بەڵام دەبێت ئاگاتان لە خۆتان بێتو کەس پێتان نەزانێت، منیش بۆ بەیانی هەردوو هاوڕێم رەفیق چالاکو ئەمینی میرزا ئەحمەدم بانگکرد چووینە ماڵی خاتوو ناهیدەی شێخ سەلام یەکسەر سپاردەکان کە کۆڵەپشت بوو لە پشتی قایم کردینو وتی: هەر ئێستا بڕۆن خواتان لەگەڵ، ئێمەش بەگیانێکی کوردانەوە کەوتینەڕێ بەقسەو باس شاخو دۆڵمان بڕی پێش نیوەڕۆ گەیشتینەوە گوندی سیتەك، مامۆستا ئەحمەد مەحمودمان دۆزییەوە کەلەوێ شاردراوە (مختفی) بوو لە خۆشیدا باوەشی بۆ کردینەوە کۆڵەکانمان داماڵاندو لە بەردەمیدا دامانناو، کاتێ لە بەرچاومان کردییەوە روانیمان هەر کۆڵە چەند جوتە کڵاشی کوردی هەورامان بوو، لەوێوە پێشکەش بەجەنگاوەرانی شێخ مەحمود کرابوو، مەحمود ئەحمەد وتی: کوڕینە ئێوە ماندوون وەرن بابچینە ماڵی شێخ جەلال نیوەڕۆژ بکەن، دوای نان خواردنو پشویەکی کەم بردینی بۆ ناو شێخەڵو داربەڕوو و توەکان کە لەوێ کۆمەڵێك خەریکی گۆشت برژاندن بوون پلە گۆشتەکانیان دەکرد بەتوڵە بییەوە لە سەر ئاگر دایاندەناو بەشێوەیەکی سەرنج راکێش دەیانبرژاند. شێخ لەتیف لەولاوە لە ژێر سێبەری دارێکدا خەوتبوو، بەهاتنی ئێمە لە خەو هەستا باوەشی پیاکردینو بەگەرمی بەخێرهاتنی کردین، هەندێ گۆشتی برژاومان خوارد، شێخ لەتیف وتی: لە چ رێگایەکەوە هاتوون؟ وتمان لە هەڕوتەوە، وتی: لامان دەمێننەوە؟ وتمان نەخێر دەڕۆینەوە، وتی: کەواتە بڕۆن بۆ سەر کانیەکەی ئەزمەڕ باوکم لەوێیە چاوەڕوانی سەیارەیەکە کەلو پەلو پێداویستی بۆ بهێنێ ئەویش دەتانناسێو پیایدا دەتان نێرێتەوە. ئێمەش لەگەڵ پیاوێکدا بەخۆشییەوە ئەوکەمە رێیەمان بڕیو چووینە خزمەتی وتی: دەك بەخێربێن گەنجە خوێن گەرمەکان دیارییەکەتان لە جێی خۆیدا بوو. ئێمەش دەستیمان ماچکردو ئەویش ئەملاو ئەولای ماچکردینو دەستی بەسەرماندا هێناو وتی: کوڕەکانم میللەتی کوردو چاوی لە دەستو هیمەتی نەوەی وەکو

ئێوەوە هەیە، تادەتوانن نیشتمانپەروەرو رەوشت بەرزو پێشرەو بن تاکو مێژووی کورد بە شانازییەوە ناوتان تۆمار بکات. ئینجا بەمنی وت: ئەحمەد سەعید، وتومە تۆ جێگەی بەڕێز مستەفا بەهجەت ئەفەندی مامت دەگریتەوە، کە یەکێك بوو لەوانەی لە رووی منەوەرییەوە سەری شارەکەمانی بەرز کردووەتەوە. قەدەرێك لە خزمەتیدا دانیشتین هەر رێنمایی دەکردین لەوبەرەوە لە ژێر دەوەنێکدا کەوێك بەدەنگی بەرزو خۆشی دەیقاسپاند، شیخ مەحمود بەتوڕەییەوە وتی: ئەو کەوە نارەسەنە دوور بخەنەوە، هەرگیز کەوی وام خۆشناوێ، چونکە قەومی خۆ خۆرە. دەخوێنێت تاهاو رەگەزانی لە خشتە بباتو بیدات بە دەست راوچییەکانەوەو ئەوانیش بەکەیفی خۆیان سوکایەتیو مامەڵەیان پێبکەن. ئەوکاتە ئێمە لەو مەبەستە گەیشتین کە قەومی خۆر خۆر واتای چییە؟ ئەوەندەی نەبرد کە سەیارەکە هاتو کەلوپەلەکانی داگرتو شێخ وتی: فەرموو ئەم سێ گەنجەم نزیك شار بۆ بخەرەوە. ئێمەش خواحافیزیمان لە شێخ کردو چووینە سەیارەکەوەو گەیاندینە خوار ناو گردان لای (کوردسات) ی ئەمڕۆوە سایەقەکە وتی: لەبەر ئەوەی بەناو سەربازگەی عەسکەریەکاندا دەڕۆم هەر ئەم رێگایەش هەیە با ئێوە لێکۆڵینەوەتان لەگەڵ نەکرێو گومانتان لێ پەیدانەکەن، لێرەوە بەپێ بڕۆنەوە. ئێمەش بەپیاسە بۆ عەسرێکی درەنگ گەیشتینەوە ماڵی خۆمان. ناهیدە خانیش زۆر زۆر سوپاسی کردین.

## شێخ مەحمودی نەمرو پێشوازییەکی کتوپڕی

ئەو ساڵانەی کە بەڕێوەبەری قوتابخانەی قەرەداغی سەرەتایی بووم ١٩٤٥ ـ ١٩٤٦ دەنگێك بڵاو بوەوە لە لایەن پیاوانی شێخەوە کە هاتبوون بۆ ماڵی نوری مەلا حەکیم گوایە شێخ بەڕێوەیە بۆ ماڵیان، ئێمەیش کێچ چووە کەوڵمانەوە، بەش بەش خەڵکەکە دەیانڕوانی لە کوێوە تەشریف بێنێ. منو مامۆستاکان بڕیارمانداو قوتابیەکانمان ریز کردو فێری پێشوازیو هەندێ دروشمی کوردانەمان کردنو بردمماننە نێوان رێگەی قەرەداخو جافەران لە تەسکاییەکدا دوو داری گەورەمان داچەقاند ئەملاو ئەولایمان بەگەڵا تەنی لە شێوەی تاقدا بۆ ئەوەی کەشێخ تەشریفی هات لەوێوە دابەزێتو پێی شاد ببین. دنیا کەبەدڵی ئێمە بوو لە دوورەوە ئێمەی بەدی کردو وتی: فێڵبازینە ئەمەشتان پێکردم دەبێ لێرەوە دابەزمو بەپیادە

ئەو ماوەیە ببڕم تامالّی نوری مەلا حەکیم. ئێمە بەپیرییەوە چووینو قوتابیەکانیش بەسرودو گۆرانییەوە دەیان وت: بەخێر بێت شێخی گەورەمان بەخێر بێت، خێرو بەرەکەتی بۆ قەرەداخ هێنا بێت. لەو شوێنە دوورەوە تا گەیشتە شوێنی دیاریکراو، ناو شارۆچکەی قەرەداخ لە جەژن دەچوو. شێخ مەحمود هەر بەوە رادەگەیشت وەلاّم بداتەوەو دوعای خێر بۆ دانیشتوانو خاکی کوردستان بکاتو دەست بەسەری منداڵاندا بهێنێت فرمێسکی خۆشی لە چاوانییەوە قەیس بوو. شایەنی باسە ژنانێکی زۆر لێی کۆبونەوەو ئەگەر پارچە قوماشێکی لەولاوە دابنایە دەیاندڕیو پارچە پارچەیان دەکردو بەسەر خۆیاندا دابەشیان دەکردو دەیانوت ئەمە تەبەرکە. ئەو ئاوەی دەمی ئەوی لێبکەوتایە نەیان دەهێشت بڕژایە هەریەکە چۆڕێکی لێدەخواردەوە. تەنانەت خۆڵی ژێر پێیان ماچ دەکرد دەیانوت ئەمە سورمەی چاوانە شێخ مەحمود نەوەی کاك ئەحمەدو مەلیکی جارانی کوردستانە. شێخ مەحمود بەزمانێکی شیرینەوە سوپاسی هەستی بەرزی گەورەو بچوکی ناو شارۆچکەی قەرەداخی کرد. ئەو چەند سەعاتەی کە لە مالّی نوری مەلا حەکیم مایەوە لە گەرمەی پیرۆزبایيو پێشوازیدا ژیانی بردەسەر ئافەرینی لە یەك یەك لە مامۆستاو فەرمانبەرو قوتابیەکانیش کرد. خۆزگەم بەو رۆژانە.

# کەرکووک‌و لاپەڕەیەکی پرشنگداری تر

## مامۆستا ئەحمەد سەعید مەولوودو بەڵگەنامەیەکی مێژوویی

دەربارەی مامۆستا ئەحمەد سەعید مەولوود ـ چەندان چاو پێکەوتن‌و دیمانەمان لەگەڵیدا سازداوە بەڕاشکاوی بیرەوەریەکان‌و ڕاستیەکانی خستۆتە ڕوو لە جێگای شیاودا بڵاوکراونەتەوە. زۆر جار بەڕێزی دەی وت: بەڵگە نامەیەکی گرنگم لەلایە، خۆم ئاگاداری چونەناو ڕووداوەکەم‌و بەشداریم تیاکردوە تاماوم شانازی پێوە دەکەم. لەم بارەیەوە وتی: پێشەکی لە سەرەتای ساڵانی پەنجاکانەوە لە وەڵامی داواکارییەکی پێویستدا وەزارەتی ناوخۆی عێراق موافەقەتی لەسەر دامەزراندنی کۆمەڵێکدا، بەناوی کۆمەڵی مامۆستایان ـ **جمعية المعلمين العراق** ـ ئەوە بوو بێ پرس‌و را سەرۆك‌و سکرتێرو ئەندامانی کۆمەڵەکە لە مدیری معاریفی ئەو سەردەمەو پشکنەرو چەند مامۆستایەك دادەنرا. لە یادمە ئێمەی مامۆستا لە کاتی هەڵبژاردندا بەلیستێکی سەربەخۆ بەشداریمان کردو دەنگی زۆرمان بەلای خۆماندا ڕاکێشا. بێگومان عومەر عەلی موتە سەریف‌و دام‌و دەزگاکەی بەلایەنەوە گرانبوو.. یەکێك لە لێپرساوەکان هاتە ناومان‌و وتی: سەیرە زۆر سەیرە لە هەموو شارەکانی عێراقدا کەچواردە لیوایە هەموویان پێڕەکەی پیشوو دەرچون‌و سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە، تەنیاو تەنیا سلێمانی ئەقدەس‌و نەجەفی ئەشرەف نەبێت دڵی وەزارەتی ناوخۆی عێراقیان خستە گومانو ترس‌و نیگەرانیەوە. ئەمە چیرۆکی تایبەتی‌و درێژی خۆی هەیە. لە ١٩٥٨/٧/١٤ ڕژێمی پاشایەتی هەڵتەکی‌و کۆماری عێراق دامەزراو عەبدولکەریم قاسم بوو بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران ئیدی کۆمەڵەی مامۆستایان لە هەموو شارەکاندا هەڵوەشایەوە. لە سەرەتای مانگی کانونی دووەمی ١٩٥٩ بۆ یەکەمین جار لە عێراقدا سەندیکای مامۆستایان ـ **نقابة المعلمين** ـ لە بری کۆمەڵەی مامۆستایان دامەزراو جێگیر بوو. لە دائیرەی معاریفە وە دەستەیەکی دامەزرێنەریان دەست نیشانکرد بۆ سەر پەرشتی هەڵبژاردن لە تێکڕای لیواکاندا. لە ڕۆژی ١٩٥٩/٢/٥ کۆنفراسی سەندیکای مامۆستایانی عێراق لە شاری بەغدادی پایتەخت، لە هۆڵی **(الوطنية)** بەسترا، جەنابی عەبدولکەریم

قاسمیش لەویٚ ئامادەبوو. نوێنەری هەر چواردە لیواکەی عێراقی تێدابوو. هەر شارە بەرێژەی خۆی. ئێمە هەموو بە بەندەکانی رازی بووین، بەڵام وەفدەکەی کەرکوك کەکۆمەڵیٚ تورکمانی توند رەوو خۆبەرە پێشەوە بوون قایل نەبوون. هەر لەم رووەوە بەرژەوەندیی تەسکی توندرەوانەیان بریتیبوو لە کینەو ناپاکیکردن بەرامبەر راستیەکان ئەم پەرە گرافە ناهەقەیان لە دانیشتنەکەدا چەسپاند ((**نؤكد على بقاء لواء الكركوك خارج نطاف مديريه** معاريف الاكراد إن تحققت/ **وذالك لوجود أكثرية ساحقه من التركمان في هذا اللواء، نسبة الاكراد قليلة بحيث لايمكن إدخال مناطقهم ضمن المديرية المذكورة. كما أن هناك تركمان في كل من الوية أربيل والموصل و ديالي - يجب أن تضان حقوقهم كاملة..))**
دوای ئەم بانگەشە درۆو دەلەسە نارەوایە وەفدی ئەم چوار لیوایە سلێمانی، هەولێر، موسڵ، دیالە بەروویاندا تەقینەوەو داوای بەرێوەبەرێتی معاریفی کوردستانیان کرد لە کەرکوك بخرێتە سەر هەرێمی کوردستان. کورد بوونی کەرکووکیان راگەیاند. وەفدە تورکمانەکەی کەرکووك بەدرۆ خرانەوەو شەرمەزارییان بۆ مایەوە، چونکە وتمان برۆن سەر ژمێری بکەن بزانن پتر لە ٨٠٪ی دانیشتوانی شاری کەرکووك کوردنو خاکی کەرکووك بەشێکە لە خاکی کوردستان. بەداخەوە ناوی وەفدەکەی هەولێرو موسڵو دیالەم لە یاد نەماوە، چونکە تەمەنێکە، بەڵام وەفدەکەی لیوای سلێمانی لەم بەرێزانەی لای خوارەوە پێکهاتبوو کە پێیان لەسەر کوردستانبوونی معاریفی کەرکووك داگرتبوو، پێکهاتبوو لە مامۆستایان:

محەمەد عەلی مەحمود
عەبدولمەسیح ئەسکەندەر
بەهجەت سەعید کابان
کەمال جەلال غەریب
محەمەد رەشید مەحمود
عوسمان عارف
ئەحمەد سەعید مەولوود
محەمەد سالح سەعید
شەمسە فەقیٚ

درەخشان عارف نەجیب

ئەحمەد کەریم غەفور

ئامینە محەمەد

حەسیب شێخ ئەحمەد شێخ غەنی

**ئەمەش تەواوی بەڵگەنامەکەیە:**

**المشاكل الثقافية والفنية للقوميات**

**اخر مؤتمر نقابة المعلمين المنعقد بتأريخ ١٩٥٩/٢/٥ ببغداد التوصيات التالية المتعلقة بالشؤورن الثقافية للقوميات والاقليات. القومية للاسرة التعليمية في الجمهورية العراقية:**

**١–جعل المناهج موحدة في جميع أنحاء الجمهورية العراقية تحقيقا للوحدة بين كافة المواطنين على أن تؤخذ بنظر الاعتبار الميزان القومية لسائر القوميات والأقليات القومية.**

**٢– إحداث مديرية معاريف عامة اللأ كراد تشرف على التعلم في المدارس الكردية في الجمهورية العراقية من النواحي الإدارية والفنية.**

**٣- جعل الدراسة بالغة الكردية في المدارس الكردية على أن يباشر تطبيقها في الصفوف الإبتدائية الثلاثة الأولى مرةً واحدة في المدارس الكردية ألتي تجري الدراسة فيها في الوقت الحاضر باللغة العربية ثم التدرج بتدريسها في المراحل ألتي تليها حتى تشمل الدراسة الثانوية.**

**٤– تدريس اللغة ألعربية كمادة في المدارس الكردية إبتداءً من الصف الرابع الإبتدائي.**

**٥– توصي المؤتمر بتدريس اللغة الكردية في المدارس الثانوية والمتوسطة ودوور المعلمين في المناطق العربية وفتح دوورات خاصة لتعليم اللغة الكردية بغية إعداد معلمين يدرسون اللغة الكردية.**

٦– أ) تدريس تأريخ الشعب الكردي في المدارس الكردية خاصة و في العراق عامة ليكون الشعب العربي في العراق على معرفة تامة بالشعب الكردي.

ب) تدريس الأدب الكردي في المدارس الكردية.

ج) تدريس الأدب الكردي في الجامعة العراقية (بصورة إختيارية) .

د) تدريس نصوص مترجمة من الأدب الكردي في المدارس العربية ضمن مناهج المطالعة و الأدب.

٧– تطبيقاً لميثاق الوحدة الثقافية بين الجمهورية العراقية و الجمهورية العربية المتحدة، و تنفيذاً للمادة الثالثة من الدستور العراقي المؤقت التي تعتبر العرب و الأكراد شركاء في هذا الوطن يوصي المؤتمر بدراسة التأريخ الكردي في الجمهورية المتحدة.

٨– إبقاء النهج بلغتها العربية في مدارس التركمان مع ضرورة شرحها باللغة التركمانية.

٩– جعل درجة النجاح في اللغة العربية للطلاب التركمان٤٠٪ أربعون في المائة إسوة بأخوانهم الطلبة الأكراد.

١٠– تخصيص عدد من الساعات إسبوعياً لدراسة اللغة التركمانية بالحروف القديمة (العربية) في المدارس التركمانية من المرحلة الإبتدائية و المتوسطة و الثانوية وفق منهج يغرس في الطلبة حبهم للجمهورية.

١١– فسح المجال لفتح مدارس أهلية للأقايات التركمانية و الآشورية و الأرمنية يكون التدريس فيها بلغات هذه الأقليات.

١٢– تفسير الأسئلة الإمتحانية بلغة الإبتدائية في مدارس الأقليات الرسمية مع إعطاء حق الخيار في الإجابة للطالب بللغة العربية أو لغة الأقلية في المرحلة الإبتدائية في مدارس الأقليات الأهلية بالنسبة للممتحنين الخارجيين.

١٣– يوصي المؤتمر لحق تمتع الأسرة التعليمية من الطائفة اليزيدية بعطل رسمية في أعيادهم الدينية. نؤكد على بقاء لواء الكركوك خارج نطاق مديرية معارف الإكراد إن تحققت/ وذلك لوجود أكثرية ساحقة من التركمان في هذا الواء حيث أن نسبة الأكراد

قليلة بحيث لا يمكن إدخال مناطقهم ضمن المديرية المذكورة. كما أن منالك تركمان في كل من الوية أربيل والموصل وديالي يجب أن تصان حقوقهم كاملةً.

كامل حبيب  نجيب درمه چى   عادل طه    حقي الهرمزي

إننا أعضاء وفود أربيل و سليمانية والموصل والديالي نبدي تحفظاً في ضرورة إدخال لواء كركوك ضمن مديرية معارف الأكراد وإن اللواء المذكور هو من صميم منطقة كردستان العراق والأكثرية الساحقة من سكانه هي من الأكراد وإن التركمان يشكلون أقلية محدودة يحق لها فتح مدارس خاصة بها فقط وإن ماجاء بخصوص ذلك من قبل وفد لواء كركوك ليس صحيحاً وبعيداً كل البعد عن الحقيقة.

رؤساء الفود للألوية المذكورة

| رئيس وفد لواء أربيل | رئيس وفد لواء السليمانية | رئيس وفد لواء الديالي |
|---|---|---|
| موسى خليل | محمد علي مجمود | عبدالمجيد سعيد |

رئيس وفد الموصل

سعيد سليمان

# عاسەی سەکینە

## وەستا باشی لە دروستکردنی سەمەنی و گوڵاو لە شاردا

**یەکێك بوو لە مامانە ناسراوەکانی ماڵە گەورەکان**

**دکتۆرێکی بە ئەزانو ساختەچی ئەزانیو لەدوایشدا دەرکەوت کە ئەو کابرایە دەللاك بووە نەك پزیشك**

گۆڤاری سلێمانی، ژمارە ٤١

کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣

ناوی عاسمەی محەمەدی یا خاتوونە، ناسراوە بە عاسەی سەکینە کە خێزانی ئەحمەدی وەستا مەولوود مستەفا بووە، لە ساڵی ١٨٧٥ لەدایکبووە، سێ کوڕی بووە سەعید ئەحمەد وەستا مەولوود مەلا مستەفا بەهجەت بەڕێوەبەری قوتابخانەی غەفووری ئەحمەد دووکانی لە بەردەرکی سەرابوو، عاسەی سەکینە لە شاری سلێمانی ژیاوە، ماڵەکەی لە شەقامی گۆرانی ئەمڕۆ لە خوار بینایەی ئۆرزی باکەوە بووە، بە نەعاسم بەناوبانگ بوو، ئەم ژنە زۆر شارەزابوو لە دروستکردنی سەمەنیو گوڵاو تەنانەت دروستکردنی گوڵاو ببووە پیشەی، ساڵان لە بەهاردا گوڵاوی عاسمە لە شاردا بەناوبانگ بوو، چەندین کەس لەوەوە فێری دروستکردنی گوڵاوو سەمەنی بوون، ئەمی دواییان خواردەمەنیەکی تایبەت بوو بە شاری سلێمانیەوە، کە لەمەوبەر چەند جارێك لەم گۆڤارەدا لەسەری نووسراوە، ئەمە جگە لەوەی کە ئەم ژنە شارەزابوو لە مامانیو نەخۆشییەکانی ژنانداو یەکێك بووو لە مامانە ناسراوەکانی ئەو سەردەمانەی شار کە زۆربەی ماڵە دەوڵەمەندو بووەکان مامانییان پێدەکرد، تەنانەت لە شارەکانی کەرکوكو بەغدادو حیللەوە ماڵە کوردەکان هاتوون بەشوێنیدا بۆ مامانی منداڵەکانیان.

مۆڵەتی ئیشکردنی لەلایەن وەزارەتی تەندروستییەوە پێدراوە، دراوسێی هەردوو پزیشکی ئەو سەردەمانەی سلێمانی (د. مەلیكو د. جۆرج) بووە، زۆر جار ئەم دوو دکتۆرە سەردانی ماڵەکەیان کردووەو لەبارەی نەخۆشییەکانی ژنانەوە پرسیان پێکردووەو بە ڕێنماییەکانی دڵخۆش بوون، نەنەش کوردسییەکی جوانی هەبوو دۆشەکەڵەیەکی ئەختە

سەری دکتۆر لەسەری دائەنیشت، بەڕادەیەك نەخۆشی ژنانی زۆر بووە کە مایەی سەرسووڕمانی ئەو دوو پزیشکە بوو، دەرمانەکانی بریتیبوون لە بەری دارو گژووگیاو لە عەتارەکانو لادێییەکانی ئەکڕی، زۆر جار جۆی ئەو فەلاحانەی لەجۆری رووەكو گژووگیا راسپاردووە، هەندێ دەرمانیشی لە (بلەجوو عارف چاوزەقو سەید عەلی عەتار) ئەکڕی، دەرمانی بەشێوەی حەبو شافو تۆزو شلە دروست ئەکرد.

نەخۆشییەکانی چاوئێشە، زەردوییی، کەچەڵی سکچوون، زەحیری، لوتپژان، گوێیەشە، دەمووودانی چارەسەر ئەکرد، دەرمانی ددانی دروست ئەکرد، کە دانەکانی بەتەواوی سپی ئەکردەوە.

ئەو ژنە ژیرو وریایە پارەی دەرمانی لە هەژاران وەرنەئەگرت، بۆ دەرمانو تیمارکردنی منالان کە ئەچوو بۆ مامانی ماوەی هەفتەیەك ئەمایەوە لای زەیستانەکە، پاروی چەورو خزمەتی باشی ئەکراو گەلێ جار لەو ماڵەوە بۆ ماڵێکی تریان ئەبردو جاری وا هەبوو بە یەك دوو مانگ نەئەهاتە ماڵەوە.

کە ئەهاتەوە پارەو پولێکی زۆری دەست ئەکەوت، زۆر جار گلەیی لە دکتۆر عەتا ئەکرد، کە لەو سەردەمەدا پزیشکی قوتابیان بوو، ئەیگوت: کە هەندێ جار دەرمانەکانی چارەسەری ئەو نەخۆشیانە نییە.

تەنانەت ئەیگوت هەندێ جار بۆ دەوای دەردو نەخۆشییەکان پرس بە من ئەکات!! هەر ئەو دکتۆر عەتایە کە عاسمە خان بە نەزانو نەفامی ئەدایە قەڵەمو کابرایەکی لوبنانی بوو، لە عێراق بڕوانامەیەکی ساختەی دروست کردبوو، کە گوایە دەرچووی کۆلێژی پزیشکی بەیرووت بووە، کاتێکیش کە ئاشکرا بوو، دەستی کەوتەڕوو، بڕیاری گرتنی دەرچوو، ئیتر کابرا خۆی شاردەوەو لە شاردا ئەیانگوت کە کابرایەکی دەللاك بووەو بڕوانامەی ساختەی دروستکردووە.

نەنە عاسمە لە مانگی مایسی ١٩٥٧ لە تەمەنی پیریدا کۆچی دوایی کرد.

# وێنەکان



مانگی ٢\ ١٩٣٨ باخچەی گشتی سلیمانی لە راستەوە ( ئەحمەد سعید مەولود, عبدولا ئەمین مەخموری , تاهیر عارف ئاغا ) قوتابیانی خانەی مامۆستایان .



له راستەوە ( مامۆستا ئەحمەد سعید , علی مزەفر , بهجت کابان )



سالی ١٩٥٥ له پێشانگای چوارتا گیراوە, له راستەوە ( م. فەرەیدون علی ئەمین, عبدولا بەگ (نائب محافظ ), م. علی مزەفر, م. احمد سعید مولود, عمر محیدین ( رئیس الملاحظین ) .



زەڵم ساڵی ١٩٧١



قوتابخانەی عبدالله سالی ١٩٥٢, لە راستەوە عیزەت تاهیر, ئەحمد سعبد ( بەرنامەی پێشکەوتنی قەتابخانەکە دەخوێنێتەوە ) سید محسین خطاط, علی مضفر , محمد عزیز, بەهجەت کابان.



قوتابخانەی زیوەر سالی ١٩٦٠. لە راستەوە ( صلاح صالح, جلال فقی محمد, احمد سعید, مەلا نجمدین شمسدین, جەلال عزیز, نوری شیخ رەزا, نوری عبدالله) .



مصر لە ئەهرامەکان لە ١٢-٩-١٩٥٨ گیراوە .



پردێکی هەلواسراو لە کاتی دروست کردنی سەدەی دوکان لە سالە ١٩٥٤-١٩٥٥ دروست کرا هەمووشتێکی پیا ئەپەریەوە .



قوتابخانەی ئەزمر سالی ١٩٦٦ - ١٩٦٧ کمال کوردی ئێستا. وەستاوەکان: سید محسن, مـەلا محمـد ئەمین, مامۆستا سادق, کریم عبدلا , کمال کوردی, فاروق خانەقبنی, فاضل ئەحمد. دانیـشتوەکان: فائق رەشید,  یعقوب یوسف, احمد سعید, محمود محیدین, عبدولا رەزا.



تایلەند ( احمد سعید , گۆران احمد سعید )



صیدلی قوتابخانەکە ماموستا احمد سعید سەرپەرشتی دەکرد ( مامۆستا سەری قوتابیەك دەبەستێ ) سالی ١٩٥٢ .



یوسف زیتو، بهجت کابان، احمد سعید مولود. سلیمانی ١٩٥٤



فەهیمە خان ( خیزانی مامۆستا احمد ) لە سالی ١٩٦٩ گیراوە .

# بڵاوكراوەكانی پرۆژەی ( تیشك )

| زنجیرە | ناوی كتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | بەئیسلامكردنی كورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە ؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەكارییەكانی مەریوان هەڵەبجەیی لە كتێبی (سێكس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر كەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێندنامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواكەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دكتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت "بەرگی یەكەم" | جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ٧ | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیكردن، دیدێكی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەكەریم عەبدوڵڵا |
| ٩ | كوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| ١٠ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت "بەرگی دووەم" | ن: جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ١١ | مێژووی دێرینی كوردستان "بەرگی سێیەم" | ن: فازل قەرەداغی |

| ١٢ | سەدەیەك تەمەنی نووزین، مامۆستا عەبدولكەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
|---|---|---|
| ١٣ | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی كۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیكرام كەریم |
| ١٤ | لە سەرگوزشتەكانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، رووداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |
| ١٥ | پرۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان رامان و سەرنج و پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |
| ١٦ | بیست و سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی ڕەشید<br>دكتۆر صەباح بەرزنجی پێشەكی بۆ نووسیوە |
| ١٧ | قورئان وەحی ئاسمانە، نەك ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەكر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیسلام و سیاسەت، لێكۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلام و سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| ١٩ | سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا<br>پێكهاتنی، ڕێكخستنی، چەكەكانی، هێزی دەریایی و شەڕو جەنگە گرنگەكانی | ن: پرۆفیسۆر دكتۆر موحسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| ٢١ | ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەكان لە پێشكەوتنە زانستییەكاندا | ن: د. كاوە فەرەج سەعدون |
| ٢٢ | یەكەمین دەستووری نووسراو لە جیهاندا، بەڵگەنامەیەكی گرنگی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ | ن: موحەممەد حەمیدوڵڵا<br>و: شوان هەورامی |

| ٢٣ | ئیسلامناسیی یان ئیسلامنەناسیی، وەڵامێك بۆ كتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیكرام كەریم |
|---|---|---|
| ٢٤ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت "بەرگی سێیەم" | ن: جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ٢٥ | ئیشكردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پارەزانی |
| ٢٦ | دوورگەی بیناسازان، چیرۆكێكی پەروەردەییە بۆ گەورەو بچووكی ئەم نەوە نوێیە | نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان وەرگێڕانی: ئامینە صدیق عەبدولعەزیز |
| ٢٧ | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا كۆمەڵە دیدارێكە لەسەر شیعر، فەرهەنگ، زمان، تەسەووف، رۆژهەڵاتناسی، ژن، رەخنەی ئەدەبی، رووناكبیر و دەسەڵات | فەرهاد شاكەلی |
| ٢٨ | هەڵەبجە ١٨٨٩ - ١٩٣٠، لێكۆڵینەوەیەكی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |
| ٢٩ | بەرگری لە قورئان دژی رەخنەگرانی | ن: عەبدوررەحمان بەدەوی و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٣٠ | فەرموودە هاوبەشەكانی بوخاری و موسلیم | ئامادەكردن و وەرگێڕانی: حەمەكەریم عەبدوڵڵا |
| ٣١ | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، رۆڵی لە یەكخستنی میرنشینە كوردییەكاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| ٣٢ | شێخ مەحمودی حەفید (١٩٢٢ – ١٩٢٥) | ن: ئومێد حەمەئەمین |

| ٣٣ | ئیسلام لەبەردەم دوڕیاندا | ن: لیوبو لدڤایس<br>و: عەبدول حسێن |
|---|---|---|
| ٣٤ | ڕامیاری لە ئیسلامدا | ن: ئەحمەد کاکە مەحمود |
| ٣٥ | وەڵامی پرسیارەکان، ڕەواندنەوەی کۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەکانی ئیسلام | ن: دکتۆر کەریم ئەحمەد |
| ٣٦ | مرۆڤ و پەیامداری | ن: قانع خورشید |
| ٣٧ | سەید قوتب، لە هاتنەدنیاوە تا شەهیدبوون | ن: د. سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالیدی<br>و: تارق نەجیب رەشید |
| ٣٨ | عوسمانی کوڕی عەففان، کەسایەتی و سەردەمەکەی | ن عەلی موحەممەد سەللابی<br>و: حەمید موحەممەد عەبدوڵڵا |
| ٣٩ | خوانی ڕووح، توێژینەوەیەکە دەربارەی گەورەیی و پیرۆزیی نوێژ | ن: مەلا ئەحمەدی شەریعە |
| ٤٠ | ئەلفبێی لاتینی.. زمانی ستاندارد | ئامادەکردنی: رەوشت محەمەد |
| ٤١ | بنەماکانی فیقهی ئیسلامیی<br>"بەرگی یەکەم" | نووسینی: د. صباح بەرزنجی |
| ٤٢ | پوختەیەك دەربارەی ڕاگەیاندن و ڕاگەیاندنی ئیسلامیی | ن: ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی |
| ٤٣ | دەروازەیەك بۆ زانستەکانی قورئان | ن: ئیکرام کەریم |